(زنجیرەی بڵاوکراوەکانی ڕێگای ڕاست (٧)

# حوکم و ئادابەکانی

## قەرزدان و قەرزکردن و قەرزدانەوە

ئامادەکردنی
م. محمد عبدالرحمن لطيف

چاپی پێنجەم

**ناوی کتێب :** **حوکم و ئادابەکانی قەرزدان و قەرزکردن و قەرزدانەوە ...**

**ناوی نووسەر :** محمد عبد الرحمن لطيف .

**ژمارەی سپاردن :** ژمارە ( ٣٤٦)ی ساڵی (٢٠٠٢) پێ دراوە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە .

**زنجیرە :** زنجیرەی (٧) حەوتەم لە زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست .

**نۆرە و ساڵی چاپ :** پێنجەم - (١٤٣٥ هـ / ٢٠١٤) .

**چاپ خانە :** چاپەمەنی زانا / سلێمانی .

**بنکەی بڵاوکردنەوە :** **کتێبخانەی سوننە ـ سلێمانی .**

**کتێبخانەی پێشین ـ هەولێر .**

**کتێبخانەی بەهەشت ـ کەلار .**

**کتێبخانەی سیما ـ چەمچەماڵ .**

**کتێبخانەی دێرین ـ سۆران .**

**لە بڵاوکراوەکانی**

**کتێبخانەی زانستی بەسوود / کەلار**



قال الإمام الشافعي رحمهُ الله :

كُلُّ العُلومِ سِوَى القُرآنِ مَشغَلَة ... إلاَّ الحَديثَ وإلاَّ الفِقْهَ في الدِّينِ

العِلمُ ما كانَ فيهِ قال حَدَّثنا ... وما سِوَى ذَاكَ وَسواسُ الشَّياطينِ

Kteb Xana کتـــێـــبـخـانـــه

public channel

Description

کتێبخانە پێگەیەکە بۆ زیاتر فێربون و دورکەوتنەوە لە نەزانین.
📚

هۆشیاری ڕۆشنبیری تاک لە کۆمەڵگە.
پەرەپێدانی ڕۆشنبیری تاک.
گەشەپێدانی هزری تاک.

@haval_pashaie10

ئـەکاونـتــەکانـــم ✔️ ⬇️
https://linktr.ee/havalpashaie

t.me/kteb_khana2

Invite Link

Notifications

On



بسم الله الرحمن الرحيم

## * پێشەکی :

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالنَا مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ .

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ .

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ [آل عمران].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾﴾ [سورة النساء] .

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ [سورة الأحزاب] .

أَمَّا بَعْدُ ...

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ) وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ .

**خوێنەری بەڕێز** : سوپاس بۆ خوای پەروەردگار وا بۆ جاری دووەم ئەم کتێبەی بەردەستت ئامادەدەکەمەوە بۆ چاپ لە پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێك بەسەر تەواوبوونی هەموو نوسخەکانی چاپی یەکەمیدا ، ئەمەش لەگەڵ هەندێك بۆ زیاد کردن و پێداچوونەوە و ڕاستکردنەوەی هەڵە چاپییەکان .

نووسەر

محمد عبد الرحمن لطيف

کتێبخانەی زانستی بەسوود / کەلار

٥ / ذو الحجة / ١٤٣١ هـ ـ ١١ / ١١ / ٢٠١٠

کوردستان / گەرمیان / کەلار

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار کە فەرموویەتی :

﴿وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ ﴿٢﴾﴾ [المائدة] .

واتە : هاوکاری یەکتر بکەن لە سەر چاکەکردن و خۆ پارێزی کردن لە تاوان .

وە صەلات و سەلامی خوا لە سەر پێغەمبەرەکەی بێت کە فەرموویەتی : ((... وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ))[1].

واتە : خوای پەروەردگار لە هاوکاری عەبدەکەیدایە تاوەکو ئەو عەبدە لە هاوکاری براکەیدا بێت .

وە سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا لە سەر صەحابە و پیاوچاکان و شوێنکەوتووانیان بێت کە بەردەوام لە هاوکاری کردنی یەکتردا بوون و لە کاتی قەرزدان و بەدەم یەکترەوە هاتن و بە هەمان شێوەش لە کاتی قەرزدانەوە و وەفاداری بەرامبەر بە خاوەن قەرزەکە پەیڕەوکاری ڕاستەقینەی فەرمانەکانی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی بوون (ﷺ) .

**خوێنەری یەکخوا پەرست و شوێن کەوتەی پێغەمبەر (ﷺ) :**

لەم نووسراوەدا باس لە بابەتێکی زۆر گرنگ دەکەین لە بابەتەکانی کڕین و فرۆشتن (**البیوع والمعاملات**) کە بریتی‌یە لە حوکم و ئادابەکانی (**قەرزدان و قەرزکردن و قەرزدانەوە**) کە لەم ڕۆژگارەدا زۆربەی هەرە زۆری موسڵمانانی بێزار و هەراسان کردووە و بەردەوام دەناڵێنن و هاوار دەکەن لە ئاستی کەسانی قەرزار بە گشتی و قەرزکوێرەکانیش بە تایبەتی !!!

هۆی سەرەکی ئەم کێشە ناهەموارەش دەگەڕێتەوە بۆ نەمانی ترسی خوای گەورە لە ناو دڵی زۆرینەی خەڵکدا بە گشتی و بێئاگابوون یان خۆ گێل کردن لە حوکمە شەرعی‌یەکانی ئەم بابەتەش بە تایبەتی !

بۆیە بە پێویستمان زانی ئەم بابەتە بۆ موسڵمانان ڕوون بکەینەوە لە ڕوانگەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ، بەڵکو - بە

---

[1] صحیح مسلم رقم : (٢٦٩٩) .

یارمەتی خوا - ببێتە ئاگادار کردنەوەیەك بۆ نەزان و بێئاگاکان و بیرخستنەوەیەکیش بێت بۆ ئاگاداربووان و بەڵگەیەکیش بێت بۆ سەر مل هوڕ و قەرزکوێر و ڕیبا خۆرەکان!

*** فەزڵ و گەورەیی قەرزدان :**

عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ : ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُقْرِضُ مُسْلِماً قَرْضاً مَرَّتَيْنِ إِلاَّ كَانَ كَصَدَقَتِهَا مَرَّةً))[٢] .

واتە : هەر موسڵمانێك دوو جار قەرز بدات بە موسڵمانێکی تر ئەوە وەکو ئەوە وایە کە یەك جار کردبێتی بە خێر و صەدەقە .

چونکە قەرزدان وەکو نیوەی خێر و صەدەقە وایە لە ڕووی پاداشتەوە لای خوای خوای پەروەردگار .

هەر وەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((إِنَّ السَّلَفَ يَجْرِي مَجْرَى شَطْرِ الصَّدَقَةِ))[٣] .

واتە : قەرزدان وەکو نیوەی خێر و صەدەقە وایە .

*** فەزڵ و گەورەیی چاوەڕوان کردن یان داشکاندن لە قەرزی قەرزاری نەدار و دەست کورت :**

خوای پەروەردگار لە قورئاندا فەرموویەتی : ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾﴾ [البقرة] * .

---

[٢] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤٣٠) .

[٣] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٥٥٣) ، وقد بوَّب لهُ الإمام الألباني رحمه الله بقوله : (فضل القرض الحسن وأنه يعدل التصدق بنصفه) وقال : (السَّلَفُ : القرضُ الذي لا منفعة للمقرض فيه) .

* قال الإمام القرطبي : (العُسرة : ضيق الحال من جهة عدم المال ومنه جيش العسرة ، والنظرة : التأخير ، والميسرة : مصدر بمعنى اليسر ، وقوله تعالى : ﴿وَأَن تَصَدَّقُوا﴾ إبتداءٌ وخبرهُ ﴿خَيْرٌ﴾ ، ندب الله تعالى بهذه الألفاظ إلى الصدقة على المعسر وجعل ذلك خيراً من إنظاره) ثُمَّ سرد الأحاديث الواردة في هذا الباب فانظر : تفسير القرطبي : (٣ / ٣٧٣ ــ ٣٧٤) .

وقال الحافظ ابن رجب الحنبلي في شرح قوله (ﷺ) : ((وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ فِي الدُّنْيَا يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ)) [صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٠٥٥)] : (والتيسير على المعسر في الدنيا من جهة

واتە : ئەگەر قەرزارەكە نەدار و دەست كورت بوو ئەوا چاوەڕوانی لێ بكەن تاوەكو دەستی دەچێت و توانای دەبێت قەرزەكە بداتەوە ، وە ئەگەر خێری پێبكەن و قەرزەكەی پێ ببەخشن ئەوە چاكترە بۆتان ئەگەر بزانن .

عَنْ بُرَيْدَةَ الأَسْلَمِيِّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ : ((مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً فَلَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ مِثْلُهُ صَدَقَةٌ قَبْلَ أَنْ يَحِلَّ الدَّيْنُ ، فَإِذَا حَلَّ الدَّيْنُ فَأَنْظَرَهُ فَلَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ مِثْلَيْهِ صَدَقَةٌ))(٤) .

واتە : هەر كەسێك چاوەڕوانی دواخستنی هێنانەوەی قەرزی لای نەدار و دەست نەڕۆیشتوویەك بكات ئەوا بۆ هەموو ڕۆژێك بە شێوە و ئەوەندەی ئەو قەرزە خێر و صەدەقەی بۆ هەیە پێش ئەوەی كاتی هاتنی دانەوەی قەرزەكە بێت ، وە هەر كەسێكیش چاوەڕوانی دواخستنی هێنانەوەی قەرزی لای نەدار و دەست نەڕۆیشتوویەك بكات دوای بە سەر ڕۆیشتنی كاتی هێنانەوەی قەرزەكە ئەوا بۆ هەموو ڕۆژێك دوو ئەوەندەی قەرزەكە خێر و صەدەقەی بۆ هەیە .

وَعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ : أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ (ﷺ) طَلَبَ غَرِيماً لَهُ فَتَوَارَى عَنْهُ ثُمَّ وَجَدَهُ فَقَالَ : إِنِّي مُعْسِرٌ ، فَقَالَ آللَّهِ ؟ قَالَ : آللَّهِ ، قَالَ : فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ : ((مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُنْجِيَهُ اللَّهُ مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلْيُنَفِّسْ عَنْ مُعْسِرٍ أَوْ يَضَعْ عَنْهُ))(٥) .

واتە : (**أبو قتادة**)ی هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕا بە دوای قەرزارێكی خۆیدا بەڵام ئەو خۆیی لێ شاردەوە ، پاشان قەرزارەكەی بینی و ئەویش ووتی : من نەدار و بێتوانام ، ئەویش فەرمووی : توو خوا نەدار و بێتوانایت ؟ ووتی : بەڵێ بە خوا نەدار و بێتوانام ، ئەویش فەرمووی : دەسا من بیستوومە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : هەر كەسێك پێی خۆشە خوای پەروەردگار ڕزگاری بكات لە ناڕەحەتییەكانی ڕۆژی

---

السـال يكون بأحد أمرين : إمَّا بإنظاره إلى الميسرة وذلك واجب كما قال تعالى : ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ﴾ ، وتارة بالوضع عنه إنْ كان غريماً وإلاَّ فبإعطائه ما يزول به إعساره وكلاهما له فضل عظيم ...) ثُمَّ سرد الأحاديث الواردة في هذا الباب فانظر : جامع العلوم والحكم : (٢ / ٢٨٩) .

(٤) سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٨٦) وصحيح الجامع الصغير رقم : (٦١٠٨).

(٥) صحيح مسلم رقم : (١٥٦٣) .

قال النووي : (وَمَعْنَى "يُنَفِّس" أَيْ يَمُدُّ وَيُؤَخِّرُ الْمُطَالَبَة) شرح صحيح مسلم : (٦ / ٧١) .

قیامەت ئەوا با داواکردنەوەی قەرزی سەر قەرزارێکی نەدار دوابخات و ماوەکەی بۆ درێژ بکاتەوە یان قەرزەکەی لە سەر کەم بکاتەوە و لایبات لەسەری .

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً أَوْ وَضَعَ لَهُ أَظَلَّهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَحْتَ ظِلِّ عَرْشِهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ))[٦] .

واتە : هەر کەسێك چاوەڕوانی دواخستنی هێنانەوەی قەرزی لای نەدار و دەست نەڕۆیشتوویەك بکات یان لە قەرزەکەی دابشکێنێت و لە سەری هەڵبگرێت ئەوا خوای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا لە (ساحەی مەحشەردا) دەیخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نی‌یە تەنها سێبەری عەرش نەبێت .

وَعَنْ عُبَادَةَ بْنِ الْوَلِيدِ بْنِ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ : (خَرَجْتُ أَنَا وَأَبِي نَطْلُبُ الْعِلْمَ فِي هَذَا الْحَيِّ مِنَ الأَنْصَارِ قَبْلَ أَنْ يَهْلِكُوا ، فَكَانَ أَوَّلُ مَنْ لَقِينَا أَبَا الْيَسَرِ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ... فَقَالَ لَهُ أَبِي : يَا عَمِّ إِنِّي أَرَى فِي وَجْهِكَ سَفْعَةً مِنْ غَضَبٍ ؟ قَالَ : أَجَلْ كَانَ لِي عَلَى فُلاَنِ بْنِ فُلاَنٍ الْحَرَامِيِّ مَالٌ فَأَتَيْتُ أَهْلَهُ فَسَلَّمْتُ فَقُلْتُ : ثَمَّ هُوَ ؟ قَالُوا : لاَ ، فَخَرَجَ عَلَيَّ ابْنٌ لَهُ جَفْرٌ فَقُلْتُ لَهُ : أَيْنَ أَبُوكَ ؟ قَالَ : سَمِعَ صَوْتَكَ فَدَخَلَ أَرِيكَةَ أُمِّي ، فَقُلْتُ : اخْرُجْ إِلَيَّ فَقَدْ عَلِمْتُ أَيْنَ أَنْتَ ، فَخَرَجَ ، فَقُلْتُ : مَا حَمَلَكَ عَلَى أَنِ اخْتَبَأْتَ مِنِّي ؟ قَالَ : أَنَا وَاللَّهِ أُحَدِّثُكَ ثُمَّ لاَ أَكْذِبُكَ خَشِيتُ وَاللَّهِ أَنْ أُحَدِّثَكَ فَأَكْذِبَكَ وَأَنْ أَعِدَكَ فَأُخْلِفَكَ وَكُنْتَ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَكُنْتُ وَاللَّهِ مُعْسِراً : قَالَ : قُلْتُ : آللَّهِ ؟ قَالَ : اللَّهِ ، قُلْتُ : آللَّهِ؟ قَالَ : اللَّهِ ، قُلْتُ : آللَّهِ ؟ قَالَ : اللَّهِ ، قَالَ : فَأَتَى بِصَحِيفَتِهِ فَمَحَاهَا بِيَدِهِ ، فَقَالَ : إِنْ وَجَدْتَ قَضَاءً فَاقْضِنِي وَإِلاَّ أَنْتَ فِي حِلٍّ ، فَأَشْهَدُ بَصَرُ عَيْنَيَّ هَاتَيْنِ ــ وَوَضَعَ إِصْبَعَيْهِ عَلَى عَيْنَيْهِ ــ وَسَمْعُ أُذُنَيَّ هَاتَيْنِ وَوَعَاهُ قَلْبِي هَذَا ــ وَأَشَارَ إِلَى مَنَاطِ قَلْبِهِ ــ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ يَقُولُ : ((مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً أَوْ وَضَعَ عَنْهُ أَظَلَّهُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ ...))[٧] .

واتە : من و باوکم دەرچووین بۆ بە دەست خستنی زانستی شەرعی لەم گەڕەکەی (ئەنصار)ەکاندا پێش ئەوەی بمرن ، جا یەکەم کەس کە پێی گەیشتین (ابو یُسر)ی هاوەڵی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) ... باوکم پێی ووت : ئەی مامە من ڕەنگی تووڕەیی

---

[٦] صحيح سنن الترمذي رقم : (١٣٠٦) وصحيح الترغيب والترهيب رقم : (٩٠٩) .

[٧] صحيح مسلم رقم : (٣٠٠٦) .

بە ڕوومەتتەوە دەبینم ، فەرمووی : بەڵی بڕێك پارەم بە لای (فلانی کوڕی فلانی حەرامی‌یەوە) بوو جا هاتم بۆ لای ماڵ و خێزانەکەی و سەلامم کرد و ووتم : (فلان) لێرەیە ؟ ووتیان : نەخێر ، ئەنجا کوڕێکی تازە پێگەیشتووی دەرچوو بۆ لام و منیش پێیم ووت : باوکت لە کوێیە ؟ ووتی : دەنگی تۆی بیست بۆیە ڕۆیشتە ناو جێگای دانیشتنی دایکمەوە ، منیش ووتم : دەرچۆ بۆ لام چونکە دەزانم تۆ لە کوێیت ، ئەنجا دەرچوو و منیش پێیم ووت : چی بوو پاڵی پێتەوە نا خۆت لێم بشاریتەوە ؟ ووتی : سوێند بە خوا من قسەت بۆ دەکەم و ئەنجا درۆشت لە گەڵدا ناکەم ، سوێند بە خوا ترسام قست لە گەڵدا بکەم و درۆ بکەم ، وە وەعد و پەیمانت پێ بدەم و نەیبەمە سەر و پێچەوانەی بکەم ، وە تۆ هاوەڵ و صەحابەی پێغەمبەری خوایت (ﷺ) ، وە سوێند بە خوا من نەدار و بێ توانام، ووتی: ووتم : توو خوا ؟ ووتی : بە خوا ، ووتم : توو خوا ؟ ووتی: بە خوا، ووتم : توو خوا؟ ووتی: بە خوا ، ئەنجا دەفتەر و لاپەڕەی قەرزەکەی هێنا و بە دەستی خۆی سڕی‌یەوە و ووتی : ئەگەر توانیت قەرزەکە بدەیتەوە ئەوا بیدەرەوە ئەگینا تۆ گەردنت ئازاد بێت، وە شایەتی دەدەم بەم دوو چاوەم بینیم ــ وە پەنجەی خستە سەر هەردوو چاوی ــ وە بە هەردوو گوێیەم بیستم و بەم دڵەشم وەرم گرتبوو ــ وە ئاماژەی کرد بۆ سەر دڵی ــ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : هەر کەسێك چاوەڕوانی دواخستنی هێنانەوەی قەرزی لای نەدار و دەست نەڕۆیشتوویەك بکات یان لە قەرزەکەی دابشکێنێت و لە سەری هەڵبگرێت ئەوا خوای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا لە (ساحەی مەحشەردا) دەیخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە .

وفــي رواية : ((مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُظِلَّهُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ فَلْيُنْظِرْ مُعْسِرًا أَوْ لِيَضَعْ لَهُ))[٨].

واتە : هەر کەسێك پێی خۆشە خوای پەروەردگار لە (ساحەی مەحشەردا) بیخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە ئەوا با چاوەڕوانی دواخستنی هێنانەوەی قەرزی لای نەدار و دەست نەڕۆیشتوو بکات یان با لە قەرزەکەی دابشکێنێت و لە سەری هەڵبگرێت .

وَعَنْ حُذَيْفَةَ (ﷺ) قَالَ ; قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((تَلَقَّتِ الْمَلائِكَةُ رُوحَ رَجُلٍ مِمَّنْ كَانَ

---

[٨] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤١٩) .

قَبْلَكُمْ فَقَالُوا : أَعَمِلْتَ مِنَ الْخَيْرِ شَيْئًا ؟ قَالَ : لاَ ، قَالُوا : تَذَكَّرْ ، قَالَ : كُنْتُ أُدَايِنُ النَّـاسَ فَآمُرُ فِتْيَانِي أَنْ يُنْظِرُوا الْمُعْسِرَ وَيَتَجَوَّزُوا عَنِ الْمُوسِرِ ، قَالَ : قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ : تَجَـوَّزُوا عَنْهُ))[٩] .

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : فریشتەكان (ڕۆحی) پیاوێك لەوانەی پێش ئێوەیان وەرگرت ، ئەنجا ووتیان : ئایا تۆ هیچ خێر و چاكەت كردووە ؟ ئەویش ووتی : نەخێر ، ووتیان : بیربكەرەوە ، ووتی : مـن قـەرزم دەدا بە خەڵك و ئەنجا فەرمانم دەكرد بە خزمەتكار و كارمەندەكانم كەوا چاوەڕوانی دواخستنی هێنانەوەی قـەرزی لای نـەدار و دەست نەڕۆیشتوو بكەن و خاتری دەستڕۆیشتوویش بگرن و چاوپۆشیشی لـێبكەن ، فەرمووی : خوای گەورە و بە تواناش بە فریشتەكانی فـەرموو : ئێوەش لـێی ببورن و چاو پۆشی لـێ بكەن .

*** بەزەیی هاتنەوە بە قەرزاری نەدار و دەست كورت بەشێكە لە چاكە :**

عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ : سَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) صَوْتَ خُـصُومٍ بِالْبَـابِ عَالِيَـةً أَصْوَاتُهُمَا وَإِذَا أَحَدُهُمَا يَسْتَوْضِعُ الآخَرَ وَيَسْتَرْفِقُهُ فِي شَيْءٍ وَهُوَ يَقُولُ : وَاللَّـهِ لاَ أَفْعَـلُ ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَيْهِمَا فَقَالَ : ((أَيْنَ الْمُتَأَلِّي عَلَى اللَّهِ لاَ يَفْعَلُ الْمَعْرُوفَ ؟ قَالَ : أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ فَلَهُ أَيُّ ذَلِكَ أَحَبَّ))[١٠] .

---

[٩] صحيح البخاري رقم : (٢٣٩١) وصحيح مسلم رقم : (١٥٦٠) واللفظ لـمسلم .

قال الإمام النووي : (وَفِي هَذِهِ الْأَحَادِيث : فَضْلُ إِنْظَارِ الْمُعْسِرِ ، وَالْوَضْعِ عَنْهُ إِمَّا كُلَّ الـدَّيْنِ ، وَإِمَّـا بَعْضه مِنْ كَثِير أَوْ قَلِيل ، وَفَضْلُ الْمُسَامَحَة فِي الِاقْتِضَاء وَفِي الِاسْتِيفَاء ؛ سَوَاء اُسْتُوْفِيَ مِنْ مُوسِر أَوْ مُعْسِر ، وَفَضْلُ الْوَضْعِ مِنْ الدَّيْن ، وَأَنَّهُ لَا يَحْتَقِر شَيْء مِنْ أَفْعَال الْخَيْر ؛ فَلَعَلَّهُ سَبَب السَّعَادَة وَالرَّحْمَة) [شرح صحيح مسلم : (٦ / ٧٠)] .

وقال الإمام القرطبـي : (ففي هذه الأحاديث من الترغيب ما هو منصوص فيها ، وحديث أبـي قتادة يدل على أنَّ ربَّ الدَّين إذا علم عُسْرَةَ غريـمه أو ظنها حرمت عليه مطالبته وإنْ لـم تثبت عـسرته عند الـحاكم ، وإنظارُ الـمعسر : تأخيره إلـى أنْ يوسر ، والوضع عنه : إسقاط الدَّين عن ذمته ، وقد جمع الـمعنيين أبو اليسر لغريـمه حيث مـحا عنه الصحيفة وقال له : إنْ وجدتَ قضاءً فـاقض وإلاَّ فأنـت فـي حل) تفسير القرطبـي : (٣ / ٣٧٥) .

[١٠] صحيح مسلم رقم : (١٥٥٧) .

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێ بیستی دەمە دەمێ و دەنگ بەرزی دوو كەس بوو لە پێش دەرگاوە كەوا یەكێكیان داوای لەوەكەی تر دەكرد شتێك لە قەرزەكەی دابشكێنێت و كەم بكاتەوە لەسەری و بە بەزیی و نەرم و نیان بێت لە داوا كردنەوەی قەرزەكەیدا ، ئەویش دەیووت : سوێند بە خوا ئەمە ناكەم ، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشتە دەرەوە بۆیان و فەرمووی : كوا لە كوێیە ئەوەی كەوا سوێند بە خوا دەخوات كە خێر و چاكە نەكات ؟ ئەویش ووتی : منم ئەی پێغەمبەری خوا جا هەر كامێكیانی پێخۆشە با ئەوەیان هەڵبژێرێت .

*** ترسناكی و زیان و زەرەرەكانی قەرز و قەرزاری :**

**١ ــ قەرز و قەرزاری سەری پیاوی قەرزار لە درۆ و پەیمان شكاندنەوە دەردەكات :**

عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَكْثَرَ مَا يَتَعَوَّذُ مِنَ الْمَغْرَمِ وَالْمَأْثَمِ ؟ قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَكْثَرَ مَا تَتَعَوَّذُ مِنَ الْمَغْرَمِ : قَالَ : ((إِنَّهُ مَنْ غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ))[١١] .

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر جارێك پەنای دەگرت بە خوا لە قەرزاری و تاوانباری ، منیش ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە لە بەر چی زۆر جارێك پەنا دەگریت بە خوا لە قەرزاری ؟ فەرمووی : چونكە هەر كەسێك قەرزار بوو ئەگەر قسەی كرد درۆ دەكات و ئەگەر وەعە و پەیمانیشی دا بە جێی ناهێنێت .

وە لە فەرموودەكەی پێشوودا پیاوە قەرزارەكە ووتی : (خَشيتُ واللهِ أنْ أُحدِّثكَ فأَكذِبَكَ ، وأنْ أَعِدَكَ فأُخلِفَكَ) واتە : سوێند بە خوا ترسام قست لە گەڵدا بكەم و درۆ بكەم ، وە وەعد و پەیمانت پێ بدەم و نەیبەمە سەر و پێچەوانەی بكەم .

**٢ ــ قەرزاری پیاوی قەرزار توشی ستەم دەكات و غەیبەت كردن و سزادانیشی حەڵاڵ دەكات :**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ))[١٢] .

---

[١١] صحيح سنن النسائي رقم : (٥٤٥٤) .

واتە : دوا خستنی بردنەوەی قەرز لە لایەن كەسێكەوە كە دەستی بچێت و بتوانێت قەرزەكە بداتەوە ستەم و زوڵمە .

وە ئەوەش بزانە كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((الظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[١٣].

واتە : ستەم و زوڵم كردن تاریكی‌یە لە ڕۆژی دوایدا .

وَعَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ))[١٤].

واتە : ئەو كەسەی كە توانای هەیە قەرز بداتەوە بەڵام نایداتەوە و دوای دەخات ئەمە غەیبەت كردن و سومعەت شكاندن و سزا دان و تۆڵە لێسەندنەوەی حەڵاڵ دەكات .

وە زانایان فەرموویانە دواخستنی دانەوەی قەرز لە لایەن كەسێكەوە كە توانای هەبێت بیداتەوە و بەڵام كەم ترخەمی دەكات و بە بێ عوزر و بیانو دوای دەخات و ئەمڕۆ و بەیانی و پانزەی مانگ و سەری مانگ دەكات ئەوا یەكێك لە تاوانە گەورەكانی (الكبائر) ئەنجام داوە و پێی دەبێت بە (فاسق) و شایستەی ئەوەیە كە شكاتی لێبكرێت و بەند و سجنیش بكرێت .

**٣ ـ قەرز و قەرزاری هەندێك جار موسڵمان دووچاری ریبا خواردن دەكاتەوە :**

ئەم خاڵە لە كۆتایی ئەم نووسراوەدا بە ووردی ڕوون دەكەینەوە (إنْ شاء الله) .

**٤ ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی جەنازەی نەدەكرد لە سەر مردووی قەرزار :**

عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ : ((كَانَ رَسُولُ (ﷺ) لاَ يُصَلِّي عَلَى رَجُلٍ مَاتَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ ...))[١٥].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی جەنازەی نەدەكرد لە سەر پیاوی مردوو ئەگەر قەرزار بیوایە ...

---

[١٢] صحيح البخاري رقم : (٢٢٨٧) و (٢٤٠٠) وصحيح مسلم رقم : (١٥٦٤) .

[١٣] صحيح البخاري رقم : (٢٤٤٧) وصحيح مسلم رقم : (٢٥٧٩) .

[١٤] صحيح سنن أبي داود رقم : (٣٦٢٨) وصحيح سنن النسائي رقم : (٤٣٧٣) .

[١٥] صحيح سنن أبي داود رقم : (٣٣٤٣) وصحيح سنن النسائي رقم : (١٩٦٢) .

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ الْمُتَوَفَّى عَلَيْهِ الدَّيْنُ فَيَقُولُ : ((هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ مِنْ قَضَاءٍ ؟ فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّهُ تَرَكَ وَفَاءً صَلَّى عَلَيْهِ وَإِلاَّ قَالَ لِلْمُسْلِمِينَ : صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ ...))[١٦].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوی مردووی قەرزاریان دەهێنا بۆ لای و ئەویش پرسیاری دەكرد ئایا هیچ پارەی بە جێهێشتووە بۆ قەرزەكەی ؟ جا ئەگەر پێی بووترایە ئەوەندەی بە جێهێشتووە كە بەشی قەرزەكەی بكات ئەوا نوێژی جەنازەی لە سەر دەكرد ئەگینا بە موسڵمانانی دەفەرموو : خۆتان نوێژ لە سەر هاوەڵەكەتان بكەن ...

وَعَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ : ((مَاتَ رَجُلٌ فَغَسَّلْنَاهُ وَكَفَّنَّاهُ وَحَنَّطْنَاهُ وَوَضَعْنَاهُ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) حَيْثُ تُوضَعُ الْجَنَائِزُ عِنْدَ مَقَامِ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ ، ثُمَّ آذَنَّا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بِالصَّلاَةِ عَلَيْهِ فَجَاءَ مَعَنَا خُطًى ثُمَّ قَالَ : لَعَلَّ عَلَى صَاحِبِكُمْ دَيْناً ؟ قَالُوا : نَعَمْ دِينَارَانِ ، فَتَخَلَّفَ ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَّا يُقَالُ لَهُ أَبُو قَتَادَةَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ هُمَا عَلَيَّ ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ : هُمَا عَلَيْكَ وَفِي مَالِكَ وَالْمَيِّتُ مِنْهُمَا بَرِيءٌ ؟ فَقَالَ : نَعَمْ ، فَصَلَّى عَلَيْهِ ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا لَقِيَ أَبَا قَتَادَةَ يَقُولُ : مَا صَنَعَتِ الدِّينَارَيْنِ ؟ حَتَّى كَانَ آخِرَ ذَلِكَ قَالَ : قَدْ قَضَيْتُهُمَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ، قَالَ : الآنَ حِينَ بَرَدَتْ عَلَيْهِ جِلْدُهُ))[١٧].

واتە : پیاوێك مرد و ئێمەش شۆردمان و كفن پۆش و بۆن خۆشمان كرد و لەو جێگایەدا دامان نا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) كەوا جەنازەی تێدا دادەنرێت بۆ كردنی نوێژی مردوو لە لای جێگای وەستانی جبریل ، پاشان پێغەمبەری خوامان (ﷺ) ئاگادار كردەوە بۆ ئەوەی نوێژی جەنازەی لە سەر بكات جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند هەنگاوێك لە گەڵماندا هات و ئەنجا فەرمووی : لەوانەیە هاوەڵە مردووەكەتان قەرزی بە سەرەوە بێت ؟ ووتیان : بەڵێ دوو دینار قەرزارە ، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی دوا

---

[١٦] صحيح سنن الترمذي رقم : (١٠٧٠) .

[١٧] رواهُ الحاكم : (٢ / ٥٨) والبيهقي : (٦ / ٧٤) وحسنهُ الألباني في صحيح الجامع الصغير رقم : (٢٧٥٣) وأصلهُ في صحيح البخاري رقم : (٢٢٨٩) وانظر : فتح الباري شرح صحيح البخاري : (٤ / ٥٨٨ ـ ٥٩٠) .

خست و نەهات ، ئەنجا پیاوێك کە پێی دەوترا (أبو قتادة) ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەو دوو دینارە لە سەر من ، جا بەردەوام پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : ئەو دوو دینارە بژاردنی لە سەر تۆیە و دەبێت لە پارەی تۆ بدرێتەوە و مردووەکەش بێبەرییە لێی ؟ ووتی : بەڵێ ، ئەنجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لە سەر جەنازەکە کرد ، وە بەردەوام پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر بگەشتبایەت بە (أبو قتادة) پێی دەفەرموو : دوو دینارەکە چیان بە سەر هات ؟ هەتاوەکو لە دوا جاریاندا ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا بژاردوومن ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی : ئا ئێستا پێستی ئەو مردووە فێنك بوویەوە .

قال الحافظ ابن حجر : (وَفِي هَذَا الْحَدِيث : إِشْعَار بِصُعُوبَة أَمْر الدَّيْن ، وَأَنَّهُ لَا يَنْبَغِي تَحَمُّله إِلَّا مِنْ ضَرُورَة)[١٨] .

واتە : لەم فەرموودەیەوە هەست بەوە دەکەیت کەوا قەرز و قەرزاری چەند نارەحەت و قورسە ، وە نابێت خۆت بخەیتە ژێر قەرزەوە ئیللا لە کاتی زۆر پێویست و زەروردا نەبێت .

**٥ ــ مردووی قەرزار لە چاکەکانی قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە :**

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ دِينَارٌ أَوْ دِرْهَمٌ قُضِيَ مِنْ حَسَنَاتِهِ لَيْسَ ثَمَّ دِينَارٌ وَلاَ دِرْهَمٌ))[١٩] .

واتە : هەر کەسێك بمرێت و دینارێك یان درهەمێك قەرزی بە سەرەوە بێت ئەوا لە چاکەکانی ئەو قەرزەی بۆ دەدرێتەوە ، لە رۆژێکدا کە دینار و درهەم نییە .

**٦ ــ مردووی قەرزار ئەگەر شەهیدیش بێت ناچێتە ناو بەهەشتەوە تاوەکو قەرزەکەی بۆ نەبژێردرێت :**

عَنْ ثَوْبَانَ (رضي الله عنه) مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ : ((مَنْ فَارَقَ الرُّوحُ الْجَسَدَ وَهُوَ بَرِيءٌ مِنْ ثَلاَثٍ دَخَلَ الْجَنَّةَ : مِنَ الْكِبْرِ وَالْغُلُولِ وَالدَّيْنِ))[٢٠] .

---

[١٨] فتح الباري شرح صحيح البخاري : (٤ / ٥٩٠) .

[١٩] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤١٤) .

واتە : هەر کەسێك (ڕۆح و گیانی) جیابوویەوە لە لاشەی و بێبەری بوو لە سێ شت ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە : فیز زلی و خۆبەزل زانین ، و دزی کردن لە دەستکەوتی جەنگ پێش دابەش کردنی ، و قەرز .

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ))[٢١] .

واتە : (ڕۆح و گیانی) ئیماندار پەیوەست و هەڵواسراوە بەو قەرزەوە کە لە سەریەتی تاوەکو بۆی دەدرێتەوە .

قال الصنعاني : (وَهَذَا الْحَدِيثُ مِنْ الدَّلَائِلِ عَلَى أَنَّهُ لَا يَزَالُ الْمَيِّتُ مَشْغُولاً بِدَيْنِهِ بَعْدَ مَوْتِه ، فَفِيهِ حَثٌّ عَلَى التَّخَلُّصِ عَنْهُ قَبْلَ الْمَوْتِ ، وَأَنَّهُ أَهَمُّ الْحُقُوقِ ، وَإِذَا كَانَ هَذَا فِي الدَّيْنِ الْمَأْخُوذِ بِرِضَا صَاحِبِهِ فَكَيْفَ بِمَا أُخِذَ غَصْبًا وَنَهْبًا وَسَلْبًا؟!)[٢٢] .

واتە : ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە بەردەوام مردوو دوای مردنی خەریکە و پەیوەستە بە قەرزەکەیەوە ، بۆیە هاندانی تێدایە بۆ خۆ ڕزگار کردن لە قەرز پێش مردن ، وە قەرزیش گرنگترین ماف و حەقی خەڵکە بە سەر مردووەوە ، جا ئەگەر ئەمە بۆ پارە و ماڵێك بێت کە بە ڕەزامەندی خاوەنەکەی بە قەرز برا بێت .. دەبێت ئەوەی کە بە دەست بەسەرا گرتن و بە زۆرداری و بە تالانی دەبرێت چۆن بێت؟ ! .

وَعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((يُغْفَرُ لِلشَّهِيدِ كُلُّ ذَنْبٍ إِلاَّ الدَّيْنَ))[٢٣] .

واتە : خوا لە هەموو تاوانێکی شەهید خۆش دەبێت تەنها لە قەرز نەبێت .

وفي رواية : ((الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُكَفِّرُ كُلَّ شَيْءٍ إِلاَّ الدَّيْنَ)) .

واتە : شەهیدبوون لە پێناوی خوادا دەبێتە کەفارەت و هۆی سڕینەوەی هەموو تاوانێك تەنها قەرز نەبێت .

---

[٢٠] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٧٨٥) وصحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤١٢) .

[٢١] صحيح سنن الترمذي رقم : (١٠٧٨) وصحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤١٣) .

[٢٢] سبل السلام شرح بلوغ المرام : (٢ / ٩٢) . [٢٣] صحيح مسلم رقم : (١٨٨٦) .

وَعَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جَحْشٍ (ﷺ) قَالَ : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَاعِدًا حَيْثُ تُوضَعُ الْجَنَائِزُ فَرَفَعَ رَأْسَهُ قِبَلَ السَّمَاءِ ثُمَّ خَفَضَ بَصَرَهُ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى جَبْهَتِهِ فَقَالَ : سُبْحَانَ اللَّهِ مَا أُنْزِلَ مِنْ التَّشْدِيدِ ! قَالَ : فَتَفَرَّقْنَا وَسَكَتْنَا ، حَتَّى إِذَا كَانَ الْغَدُ سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ فَقُلْنَا : مَا التَّشْدِيدُ الَّذِي نُزِّلَ فِي الدَّيْنِ ؟ قَالَ : ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ قُتِلَ رَجُلٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ عَاشَ ثُمَّ قُتِلَ ثُمَّ عَاشَ ثُمَّ قُتِلَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ مَا دَخَلَ الْجَنَّةَ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ دَيْنُهُ))[٢٤].

وفي رواية : ((سُبْحَانَ اللَّهِ مَاذَا أُنْزِلَ مِنَ التَّشْدِيدِ فِي الدَّيْنِ ؟ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ رَجُلاً قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ أُحْيِيَ ، ثُمَّ قُتِلَ ثُمَّ أُحْيِيَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ مَا دَخَلَ الْجَنَّةَ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ دَيْنُهُ))[٢٥].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو جێگایەدا دانیشتبوو کەوا جەنازەی تێدا دادەنرێت ، ئەنجا سەری بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان ئەنجا چاوی بەرەو زەوی نزم کردەوە و دەستی خستە سەر تێوڵی (نێوچاوانی) و پاشان ووتی : پاکی و بێگردی بۆ خوا لە هەموو کەم و کوڕییەك .. ئەوە چی دابەزیوە لە توندی و نارەحەتی ! ئەنجا ئێمەش هەستاین و بێدەنگ بووین ، جا کە بەیانی هات پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ووتمان : ئەو توندی و نارەحەتی‌یە چی بوو کە دابەزی ؟ فەرمووی : سەبارەت بە قەرز بوو ، سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە ئەگەر پیاوێك لە پێناوی خوادا بکوژرێت ، و ئەنجا زیندوو ببێتەوە و ئەنجا بکوژرێت ، ئەنجا زیندوو ببێتەوە و ئەنجا بکوژرێت بەڵام قەرزی بە سەرەوە بێت ئەوا ناچێتە ناو بەهەشتەوە هەتاوەکو قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە .

وَعَنْ سَعْدِ بْنِ الأَطْوَلِ (ﷺ) أَنَّ أَخَاهُ مَاتَ وَتَرَكَ ثَلاَثَمِائَةِ دِرْهَمٍ وَتَرَكَ عِيَالاً فَأَرَدْتُ أَنْ أُنْفِقَهَا عَلَى عِيَالِهِ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : ((إِنَّ أَخَاكَ مُحْتَبَسٌ بِدَيْنِهِ فَاقْضِ عَنْهُ ، فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ أَدَّيْتُ عَنْهُ إِلاَّ دِينَارَيْنِ ادَّعَتْهُمَا امْرَأَةٌ وَلَيْسَ لَهَا بَيِّنَةٌ ، قَالَ : فَأَعْطِهَا فَإِنَّهَا مُحِقَّةٌ))[٢٦].

---

[٢٤] صحيح الترغيب والترهيب رقم : (١٨٠٤) .

[٢٥] صحيح سنن النسائي رقم : (٤٦٨٤) وصحيح الجامع الصغير رقم : (٣٦٠٠) .

[٢٦] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤٣٣) .

واتە : براکەم مرد و سێسەد (٣٠٠) درهەمی بە میراتی و خێزانێکی بەجێهێشت ، منیش ویستم ئەو پارەیە بدەم بە شتومەك و پێداویستی پێ بکڕم بۆ خێزانەکەی ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : براکەت بەند کراوە بە هۆی قەرزەکەیەوە بۆیە قەرزەکەی بدەرەوە ، ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا هەموو قەرزەکەم بۆ دایەوە تەنها دوو دینار نەبێت کەوا ئافرەتێك داخوازی دەکات و بەڵگەشی نیەیە ، فەرمووی : بیدەرێ چونکە ئەو لە سەر حەقە و ڕاست دەکات .

قال الحافظ ابن عبد البر : (وفي حديث هذا الباب معانٍ من الفقه :

... ومنها أنَّ المرءَ يُحبَسُ عن الجنة من أجل دَينِه حتى يقع القصاص .

ومنها أنَّ القضاءَ عن الميت بعده في الدنيا ينفع الميت في الآخرة .

ومنها أنَّ الميت إنَّما يُحبَسُ عن الجنة بدَينه : إذا كان له وفاء ولَمْ يوص به ولم يشهد عليه ، والوصية بالدَّين فرضٌ عند الجميع إذا لم يكن عليه بيِّنة ، فإذا لم يوص به كان عاصياً وبعصيانه ذلك يُحبس عن الجنة والله أعلم ...

وقد تكلمنا على هذا الدَّين هذا الذي يُحبس به صاحبه عن الجنة ، والله أعلم هو الذي قد ترك لهُ وفاء ولم يوص به أو قدر على الأداء فلم يؤده أو أدانه في غير حق أو في سرف أو في سفه ومات ولم يؤده ، وأما من أدان في حق واجب لِفاقة أو عُسرٍ ومات ولم يترك وفاء فإنَّ الله لا يَحبِسُهُ به عن الجنة إنْ شاء الله لأنَّ على السلطان فرضاً أنْ يُودي عنه دَينَهُ إما من جملة الصدقات أو من سهم الغارمين أو من الفيء الراجع على المسلمين من صنوف الفيء)[٢٧] .

*** پەنا گرتن بە خوای گەورە لە قەرز و قەرزاری :**

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَثِيراً مَا يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الدَّعَوَاتِ : ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ))[٢٨] .

---

[٢٧] التمهيد : (٢٣ / ٢٣٨ ـ ٢٣٩) ، وانظر : تفسير القرطبي : (٤ / ٢٧٤) .

[٢٨] صحيح البخاري رقم : (٦٣٦٩) ومسند الإمام أحمد رقم : (١٣٦٥٠) واللفظ له .

واتە : من زۆر جارێك دەمبيست پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم دوعايانە دەپاڕايەوە :

خوايە من پەنات پێدەگرم لە غەمباری و نارەحەتی و بێتوانايی و تەمبەڵی و ڕەزيلی و ترسنۆكی و قورسی قەرز و زاڵ بوونی پياوان .

وَعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ : ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّيْنِ ...))[٢٩].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم ووشانە دەپاڕايەوە و دوعای دەكرد و دەيفەرموو : خوايە من پەنات پێدەگرم لە زاڵ بوونی قەرز بە سەرمەوە ...

هۆی ئەمەش لەم فەرموودەيەی خوارەوەدا باس كراوە :

عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَكْثَرَ مَا يَتَعَوَّذُ مِنَ الْمَغْرَمِ وَالْمَأْثَمِ ، قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَكْثَرَ مَا تَتَعَوَّذُ مِنَ الْمَغْرَمِ ؟ قَالَ : ((إِنَّهُ مَنْ غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ))[٣٠].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر جارێك پەنای دەگرت بە خوا لە قەرزاری و تاوانباری ، منيش ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە لە بەر چی زۆر جارێك پەنای دەگرت بە خوا لە قەرزاری ؟ فەرمووی : چونكە هەر كەسێك قەرزار بوو ئەگەر قسەی كرد درۆ دەكات و ئەگەر وەعد و پەيمانيشی بدات دەيشكێنێت .

قال الحافظ ابن حجر : (قَالَ الْمُهَلَّبُ : يُسْتَفَادُ مِنْ هَذَا الْحَدِيثِ : سَدّ الذَّرَائِعِ ؛ لِأَنَّهُ (ﷺ) اسْتَعَاذَ مِنَ الدَّيْنِ ، لِأَنَّهُ فِي الْغَالِبِ ذَرِيعَةٌ إِلَى الْكَذِبِ فِي الْحَدِيثِ وَالْخُلْفِ فِي الْوَعْدِ مَعَ مَا لِصَاحِبِ الدَّيْنِ عَلَيْهِ مِنَ الْمَقَالِ ا هـ .

وَيُحْتَمَلُ أَنْ يُرَادَ بِالاسْتِعَاذَةِ مِنَ الدَّيْنِ الاسْتِعَاذَةَ مِنَ الاحْتِيَاجِ إِلَيْهِ حَتَّى لَا يَقَعَ فِي هَذِهِ الْغَوَائِلِ ، أَوْ مِنْ عَدَمِ الْقُدْرَةِ عَلَى وَفَائِهِ حَتَّى لَا تَبْقَى تَبِعَته ...

ثُمَّ رَأَيْت فِي "حَاشِيَةِ ابْنِ الْمُنِير" : لَا تَنَاقُضَ بَيْنَ الاسْتِعَاذَةِ مِنَ الدَّيْنِ وَجَوَاز الاسْتِدَانَة لِأَنَّ الَّذِي اُسْتُعِيذَ مِنْهُ غَوَائِل الدَّيْن ، فَمَنْ أَدَانَ وَسَلِمَ مِنْهَا فَقَدْ أَعَاذَهُ اللَّه وَفَعَلَ جَائِزاً ...

---

[٢٩] صحيح سنن النسائي رقم : (٥٤٨٨) وصحيح الجامع الصغير رقم : (١٢٩٦) .

[٣٠] صحيح البخاري رقم : (٢٣٩٧) .

وقال أيضاً : قَالَ ابْن الْمُنِير : أَنَّ الدَّيْنَ لَا يُخِلُّ بِالدِّينِ ، وَأَنَّ الِاسْتِعَاذَةَ مِنْهُ لَيْسَتْ لِذَاته بَلْ لِمَا يُخْشَى مِنْ غَوَائِله[٣١] .

---

[٣١] فتح الباري : (٥ / ٧٧) ، **فائدة** : ذكر الإمام القرطبي أمثلةً على غوائل الدَّين قائلاً : (قال النبي (ﷺ) : ((الدَّينُ شَيْنُ الدِّينِ)) ورُوِيَ عنه أنه قال : ((الدَّينُ هَمٌّ بالليل ومَذَلَّةٌ بالنهار)) قال علماؤنا : وإنما كان شيناً ومَذلَّةً لما فيه من شُغل القلب والبال والهَمُّ اللازم في قضائه والتذلل للغريم عند لقائه وتحمل مِنَّته بالتأخير إلى حين أوانه وربما يَعِدُ من نفسه القضاءَ فيُخلف أو يحدِّثُ الغريم بسببه فيكذِبُ أو يحلف له فيحنث ذلك ، ولهذا عليه السلام كان يتعوذ مِنَ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ وهو الدَّين فقيل له : يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَكْثَرَ مَا تَتَعَوَّذُ مِنَ الْمَغْرَمِ ؟ فقال : ((إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ)) ، وأيضاً فربما قد مات ولم يقضِ الدَّين فيرتهن به كما قال عليه السلام : ((نسمة المؤمن مرتهنة في قبره بدَينه حتى يُقضى عنه)) ، وكل هذه الأسباب مَشائن في الدِّين تُذْهِبُ جَماله وتُنقص كماله ، والله اعلم) تفسير القرطبي : (٣ / ٤١٧) .

تخريج الأحاديث التي ذكرها الإمام القرطبي في قوله هذا :

أ / ((الدَّينُ شَيْنُ الدِّينِ)) حديثٌ موضوع [سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة رقم : (٤٧٢) ، وضعيف الجامع الصغير رقم : (٣٠٣٢)] .

ب / ((الدَّينُ هَمٌّ بالليل ومَذَلَّةٌ بالنهار)) حديثٌ ضعيف جداً [سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة رقم : (٣٦١٩) ، وضعيف الجامع الصغير رقم : (٣٠٣٣)] .

ج / ((إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ)) حديث صحيح أخرجهُ البخاري رقم : (٢٣٩٧) .

د / ((نسمة المؤمن مرتهنة في قبره بدَينه حتى يُقضى عنه)) حديث صحيح أوردهُ الإمام القرطبي بمعناهُ وأصلهُ ((نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِه حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ)) [صحيح سنن الترمذي رقم : (١٠٧٨) وصحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤١٣)] ، أمَّا الحديث بلفظ : ((إِنَّ صَاحِبَ الدَّيْنِ مُرْتَهَنٌ فِي قَبْرِه حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ دَيْنُهُ)) فضعيف جداً [ضعيف الترغيب والترهيب رقم : (١١٣٦) ، وانظر : سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة رقم : (٣ / ٥٥٧)] .

**تنبيه :** ذكرتُ قول القرطبي هنا لفائدتين اثنتين هما :

١ ــ الاستئناس بما ذكرهُ من غوائل الدَّين وآفاته التي صحت بها الأحاديث.

٢ ــ التنبيه على ما ذكرهُ من الأحاديث الضعيفة ، إذ لا يجوز الاستدلال بالضعيف ولا يجوز ذكرهُ إلاَّ مع بيان ضعفه كما تقرر عند المحققين.

واتە : لەم فەرموودەیە سودێك دەبینین كە بریتی‌یە لە بنەمای (گرتنی ڕێگاكان و هۆكارەكانی بەرەو تاوان چوون / سَد الذرائع) چونكە پێغەمبەر (ﷺ) پەنای بە خوا گرتووە لە قەرز لە بەر ئەوەی زۆر جارێك قەرز ڕێگا و هۆیەكە بۆ درۆ كردن لە قسەكردن و بە جێنەهێنانی وەعد و پەیماندا لە گەڵ ئەوەی كە خاوەن قەرزەكە قسەی سوارە بە سەریەوە ، وە لەوانەیە مەبەست بە پەنا گرتن لە قەرز بریتی بێت لە پەنا گرتن لە پێویستی بوون بە قەرز تاوەكو نەكەوێتە ناو ئەم سەرئەنجامە خراپانەوە یان لەوانەیە بریتی بێت لە پەنا گرتن لە بێ‌توانا بوون لە سەر قەرزدانەوە تاوەكو بەرپرسیارێتی بە سەرەوە نەمێنێت ...

ئەنجا لە "حاشية بن المنير"دا بینیم نووسرابوو : هیچ تێهەڵچوون و پێچەوانە بوونێك نی‌یە لە نێوان (پەنا گرتن لە قەرز) و (دروستێتی قەرزكردن) چونكە ئەوەی كە پەنای لێ‌گیراوە بریتی‌یە لە سەرئەنجامە خراپ و ناهەموارەكانی قەرز ، جا هەر كەسێك قەرز بكات و سەلامەت و پارێزراو بێت لەو سەرئەنجامە خراپ و ناهەموارانەی قەرزكردن ئەوا خوا پەنای دەدات و كردەوەیەكی دروستی ئەنجامداوە .

*** دوعا كردن بۆ قەرزدانەوە :**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ : ((اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ وَرَبَّ الأَرْضِ ... اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ ...))[٣٢].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر بڕۆشتبایەتە سەر جێگای خەوتنی دوعای دەكرد و دەیفەرموو : ... خوایە قەرزم بۆ ببژێرە ...

وعن علي (ﷺ) أَنَّ مُكَاتَبَاً جَاءَهُ فَقَالَ : إِنِّي قَدْ عَجَزْتُ عَنْ كِتَابَتِي فَأَعِنِّي ، قَالَ : أَلاَ أُعلِّمُكَ كلمات عَلَّمَنِيهِنَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لَوْ كَانَ عَلَيْكَ مِثْلُ جَبَلِ صِيرٍ دَيْنَاً أَدَّاهُ اللَّهُ عَنْكَ؟ قُلِ : ((اللَّهُمَّ اكْفِنِي بِحَلاَلِكَ عَنْ حَرَامِكَ ، وَأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ))[٣٣].

---

[٣٢] صحيح سنن أبي داود رقم : (٥٠٥١) .

[٣٣] صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٥٦٣) وصحيح الترغيب والترهيب رقم : (١٨٢٠) ، وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٦٦)

واتە : کۆیلەیەك کە لە گەڵ خاوەنەکەیدا گرێبەندی خۆڕزگار کردنی بەستبوو (عقد الـمکاتبة) هات بۆ لای پێشەوای ئیمانداران (علي ﷺ) و ووتی : من لە توانامدا نییە پارەکە بدەم بە خاوەنەکەم بۆیە هاوکاریم بکە ، ئەویش فەرمووی : ئایا چەند ووشەیەکت فێرنەکەم - کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی پێ فێرکردبوو - کەوا ئەگەر بە ئەندازەی (شاخی صەبیر) قەرزت بە سەرەوە بێت ئەوا خوا بۆتی بداتەوە ، بڵێ :

((اللَّهُمَّ اكْفِنِي بِحَلاَلِكَ عَنْ حَرَامِكَ ، وَأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ)) .

واتە : خوایە بە حەڵاڵ قایلم بکە بەرامبەر بە حەرامەکانت ، وە دەوڵەمەندم بکە لە نیعمەت و چاکەکانت بەرامبەر بە جگە لە خۆت .

*** فەرمان کردن بە قەرزدانەوە :**

قەرز ئەمانەتە و دەبێت پیاوی قەرزار بیباتەوە بۆ خاوەنەکەی لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا ئەگەر کاتی بردنەوەی بۆ دیاری کرابوو یان هەر کاتێك توانای هەبوو بیباتەوە ئەوا پێویستە دوای نەخات بۆ ئەوەی نەبێت بە خیانەتکار یان ستەم کار .

خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴿٥٨﴾﴾ [النساء] .

واتە : خوا فەرمانتان پێدەکات بەوەی کە ئەمانەتەکان بدەنەوە و بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان .

جا ئەگەر ئەندازەیەك (مەبلەغێك) پارە بە قەرز ببات ئەوا دەبێتە ئەمانەتێك لە گەردنیدا و دەبێت خیانەتکار نەبێت و لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا بیباتەوە بۆ خاوەنەکەی ئەگینا ئەم فەرموودەیەی بە سەردا جێبەجێ دەبێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە قەرزار فەرموویەتی : ((إِنَّهُ مَنْ غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ)) .

واتە : هەر کەسێك قەرزار بوو ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات و ئەگەر وەعد و پەیمانیش بدات دەیشکێنێت .

لە بەر ئەمە قەرز و قەرزاری موسڵمان بەرەو ئەوە دەبات کە سیفەتە ناپاکەکانی مونافیق و دووڕووەکان لە کردار و گوفتاریدا ڕەنگبداتەوە چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ)

فەرموویەتی : ((آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ : إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ))[33].

واتە : نیشانە و سیفەتی مونافیق و دووڕوو سیانە : ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات ، وە ئەگەر وەعد و پەیمان و بەڵێن بدات دەیشکێنێت و نایباتە سەر ، وە ئەگەر ئەمانەتی خرایە ژێر دەست خیانەت دەکات .

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((لَوْ كَانَ لِي مِثْلُ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا يَسُرُّنِي أَنْ لاَ يَمُرَّ عَلَيَّ ثَلاَثٌ وَعِنْدِي مِنْهُ شَيْءٌ ، إِلاَّ شَيْءٌ أُرْصِدُهُ لِدَيْنٍ))[34].

واتە : ئەگەر بە ئەندازەی کێوی (ئوحد) زێڕ و ئاڵتونم هەبوایە پێمخۆش نەبوو سێ ڕۆژی بە سەردا بڕۆیشتبایە و هیچی لێبمایەتەوە ، ئیللا شتێك نەبێت کە هەڵیبگرم بۆ قەرزدانەوە .

قال الحافظ : (وَفِيهِ الاهْتِمَامُ بِأَمْرِ وَفَاءِ الدَّيْنِ ، وَمَا كَانَ عَلَيْهِ (ﷺ) مِنْ الزَّهَادَةِ فِي الدُّنْيَا)[35].

واتە : ئەم فەرموودەیە گرنگی دانی تێدایە بە بواری وەفاداری و دانەوەی قەرز ، وە ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سەری بووە لە دونیا نەویستن و پشت هەڵکردن لە دونیا .

*** قەرزدانەوە بە چاکە** (حُسْنُ القضاء)**:**

سوننەت وایە بە چاکی قەرز بدرێتەوە بەوەی کە زیاتر بێت لە ئەندازەی قەرزەکە یان بەوەی کە جۆرێکی چاکتر بداتەوە بە خاوەن قەرزەکە ، بەڵام ئەگەر ئەمە بە مەرج گیرابێت لە پێشەوە ئەوا دەبێت بە ریبا :

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنهما) قَالَ : ((كَانَ لِي عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) دَيْنٌ فَقَضَانِي وَزَادَنِي))[36].

---

[33] صحيح البخاري رقم : (٣٣) وصحيح مسلم رقم : (٥٩) .

[34] صحيح البخاري رقم : (٢٣٨٩) وصحيح مسلم رقم : (٢٣٤٩) .

[35] فتح الباري شرح صحيح البخاري : (٥ / ٧٠) .

فەرموویەتی : ((آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ : إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ))[٣٣].

واتە : نیشانە و سیفەتی مونافیق و دووڕوو سیانە : ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات ، وە ئەگەر وەعد و پەیمان و بەڵێن بدات دەیشکێنێت و نایباتە سەر ، وە ئەگەر ئەمانەتی خرایە ژێر دەست خیانەت دەکات .

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((لَوْ كَانَ لِي مِثْلُ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا يَسُرُّنِي أَنْ لاَ يَمُرَّ عَلَيَّ ثَلاَثٌ وَعِنْدِي مِنْهُ شَيْءٌ ، إِلاَّ شَيْءٌ أُرْصِدُهُ لِدَيْنٍ))[٣٤].

واتە : ئەگەر بە ئەندازەی کێوی (ئوحد) زێڕ و ئاڵتونم هەبوایە پێمخۆش نەبوو سێ ڕۆژی بە سەردا بڕۆیشتبایە و هیچی لێبمایەتەوە ، ئیللا شتێك نەبێت کە هەڵیبگرم بۆ قەرزدانەوە .

قال الحافظ : (وَفِيهِ الاهْتِمَامُ بِأَمْرِ وَفَاءِ الدَّيْنِ ، وَمَا كَانَ عَلَيْهِ (ﷺ) مِنَ الزَّهَادَةِ فِي الدُّنْيَا)[٣٥].

واتە : ئەم فەرموودەیە گرنگی دانی تێدایە بە بواری وەفاداری و دانەوەی قەرز ، وە ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سەری بووە لە دونیا نەویستن و پشت هەڵکردن لە دونیا .

*** قەرزدانەوە بە چاکە** (حُسْنُ القضاء):

سوننەت وایە بە چاکی قەرز بدرێتەوە بەوەی کە زیاتر بێت لە ئەندازەی قەرزەکە یان بەوەی کە جۆرێکی چاکتر بداتەوە بە خاوەن قەرزەکە ، بەڵام ئەگەر ئەمە بە مەرج گیرابێت لە پێشەوە ئەوا دەبێت بە ڕیبا :

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((كَانَ لِي عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) دَيْنٌ فَقَضَانِي وَزَادَنِي))[٣٦].

---

[٣٣] صحيح البخاري رقم : (٣٣) وصحيح مسلم رقم : (٥٩) .

[٣٤] صحيح البخاري رقم : (٢٣٨٩) وصحيح مسلم رقم : (٢٣٤٩) .

[٣٥] فتح الباري شرح صحيح البخاري : (٥ / ٧٠) .

واتە : قەرزم بە لای پێغەمبەرەوە بوو (ﷺ) جا قەرزەکەی دامەوە و زیاتریشی پێدام .

وَعَنْ أَبِي رَافِعٍ (رضي الله عنه) قَالَ : ((اسْتَسْلَفَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَكْرًا ، فَجَاءَتْهُ إِبِلٌ مِنَ الصَّدَقَةِ فَأَمَرَنِي أَنْ أَقْضِيَ الرَّجُلَ بَكْرَهُ ، فَقُلْتُ : لَمْ أَجِدْ فِي الإِبِلِ إِلاَّ جَمَلاً خِيَارًا رَبَاعِيًا ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : أَعْطِهِ إِيَّاهُ فَإِنَّ خِيَارَ النَّاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً))[٣٧].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووشترێکی پێگەیشتووی قەرز کرد ، پاشان ووشتری صەدەقەی بۆ هات و دوای ئەوە فەرمانی پێکردم کە ووشترێکی پێگەیشتوو بدەمەوە بە خاوەنەکەی ، ووتم : لە ناو ووشترەکاندا هیچم نەبینییەوە جگە لە ووشتری چاك و چوار ساڵە نەبێت ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : یەکێك لەوانەی بدەرێ چونکە باشترینی خەڵك ئەو کەسەیە کە قەرز بە باشترین و چاکترین شێوە دەداتەوە .

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ : ((كَانَ لِرَجُلٍ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) سِنٌّ مِنَ الإِبِلِ فَجَاءَهُ يَتَقَاضَاهُ فَقَالَ : أَعْطُوهُ ، فَطَلَبُوا سِنَّهُ فَلَمْ يَجِدُوا لَهُ إِلاَّ سِنًّا فَوْقَهَا ، فَقَالَ : أَعْطُوهُ ، فَقَالَ : أَوْفَيْتَنِي أَوْفَى اللَّهُ بِكَ ، قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : إِنَّ خِيَارَكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً))[٣٨].

واتە : پیاوێك وشترێکی تەمەن دیاریکراوی لە لای پێغەمبەر (ﷺ) بوو بە قەرز جا هات بۆ لای داوای قەرزەکەیی لێ بکاتەوە ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : بیدەنەوە پێی ، صەحابەکانیش گەڕان بە دوای ئەو تەمەنەدا دەستیان نەکەوت ئیللا تەمەنێکی بەرەو سەروتری نەبێت ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : یەکێك لەوانەی پێبدەن ، ئەویش وتی : بە باشی قەرزەکەت پێدامەوە خوا بە باشە پاداشتت بداتەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : باشترینتان ئەو کەسەیە کە قەرز بە باشترین و چاکترین شێوە دەداتەوە .

قال النووي : (وَفِي هَذَا الْحَدِيث : جَوَاز الِاقْتِرَاض وَالِاسْتِدَانَة ، وَإِنَّمَا اقْتَرَضَ النَّبِيُّ (ﷺ)

---

[٣٦] صحيح البخاري رقم : (٢٣٩٤) وصحيح مسلم رقم : (٦١٥) .

[٣٧] صحيح البخاري رقم : (٢٣٩٣) وصحيح مسلم رقم : (١٦٠٠) وصحيح أبي داود رقم : (٣٣٤٨) واللفظ لـه .

[٣٨] صحيح البخاري رقم : (٢٣٩٣) وصحيح مسلم رقم : (١٦٠٠) واللفظ للبخاري .

لِلْحَاجَة ، وَكَانَ (ﷺ) يَسْتَعِيذ بِاللَّهِ مِنْ الْمَغْرَم ، وَهُوَ الدَّيْن ...

وَفِيه : أَنَّهُ يُسْتَحَبُّ لِمَنْ عَلَيْهِ دَيْنٌ مِنْ قَرْض وَغَيْره أَنْ يَرُدَّ أَجْوَد مِنْ الَّذِي عَلَيْهِ ، وَهَذَا مِنْ السُّنَّة وَمَكَارِم الْأَخْلَاق ، وَلَيْسَ هُوَ مِنْ قَرْض جَرَّ مَنْفَعَة فَإِنَّهُ مَنْهِيٌّ عَنْهُ ؛ لِأَنَّ الْمَنْهِيَّ عَنْهُ مَا كَانَ مَشْرُوطًا فِي عَقْد الْقَرْض ، وَمَذْهَبنَا أَنَّهُ يُسْتَحَبّ الزِّيَادَة فِي الْأَدَاء عَمَّا عَلَيْهِ ، وَيَجُوز لِلْمُقْرِضِ أَخْذهَا سَوَاء زَادَ فِي الصِّفَة أَوْ فِي الْعَدَد بِأَنْ أَقْرَضَهُ عَشَرَة فَأَعْطَاهُ أَحَد عَشَر ... وَحُجَّة أَصْحَابنَا عُمُوم قَوْله (ﷺ) : "خَيْركُمْ أَحْسَنكُمْ قَضَاء")[٣٩].

واتە : لە سودەکانی ئەم فەرموودەیە :

ـ قەرز کردن دروستە ، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بەر پێویستی قەرزی کردووە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) پەنای دەگرت بە خوا لە قەرزاری .

ـ سوننەتە بۆ ئەو کەسەی کە قەرزی بە سەرەوەیە کەوا لەوە باشتر و چاکتر بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی کە لە سەریەتی ، وە ئەمەش بەشێکە لە سوننەت و ڕەوشتە جوان و پیرۆزەکان ، وە لە بابەتی (هەر قەرزێك سودێك بێنێت ریبایە) نییە چونکە ئەمە قەدەغەکراوە و ڕێی پێنەدراوە ، چونکە ئەوەی کە قەدەغە کراوە و ڕێی پێنەدراوە بریتییە لەوەی کە بە مەرج دەگیرێت لە (عەقدی) قەرزەکەدا ، وە بۆچوونی ئێمەش وایە کە سوننەتە لە کاتی قەرزدانەوەدا زیاتر بدرێتەوە لەوەی کە لە سەریەتی ، وە دروستیشە بۆ خاوەن قەرزەکە ئەو زیادەیە وەربگرێت ، جا زیادەکە لە جۆر و شێوەی شتەکەدا بێت یان لە ژمارەدا بێت هەر وەکو یەك وایە لە بەر گشتێتی فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی : باشترینتان ئەو کەسەیە کە قەرز بە باشترین و چاکترین شێوە دەداتەوە .

وقال الحافظ ابن حجر : (وَفِيهِ : أَنَّ مَنْ عَلَيْهِ دَيْن لَا يَنْبَغِي لَهُ مُجَافَاة صَاحِب الْحَقّ ... وَفِيهِ جَوَاز وَفَاء مَا هُوَ أَفْضَل مِنْ الْمِثْلِ الْمُقْتَرَض إِذَا لَمْ تَقَعْ شَرْطِيَّة ذَلِكَ فِي الْعَقْد فَيَحْرُمُ حِينَئِذٍ اتِّفَاقًا ...)[٤٠].

---

[٣٩] شرح صحيح مسلم : (٦ / ١١٦) .

[٤٠] فتح الباري شرح صحيح البخاري : (٥ / ٧٢ ــ ٧٣) .

واتە : ئەم فەرموودە ئەوە دەگەیەنێت كە : هەركەسێك قەرزی بە سەرەوە بوو ئەوا نابێت ووشك و ڕەق بێت لە گەڵ خاوەن حەقدا ...

وە قەرزدانەوە دروستە بە شتێكی باشتر و چاكتر لەوەی كە بە قەرز براوە ئەگەر ئەمە بە مەرج نەگیرابێت لە سەرەتای مامەڵەكەوە ئەگینا ئەو كاتە حەرام دەبێت بە كۆڕای زانایان .

*** زیكری كاتی قەرزدانەوە :**

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ (ﷺ) أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) اسْتَسْلَفَ مِنْهُ حِينَ غَزَا حُنَيْنًا ثَلَاثِينَ أَوْ أَرْبَعِينَ أَلْفًا فَلَمَّا قَدِمَ قَضَاهَا إِيَّاهُ ثُمَّ قَالَ لَهُ النَّبِيُّ : ((**بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ الْوَفَاءُ وَالْحَمْدُ**))[٤١].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە كاتی (غەزای حونەین)دا سی یان چل هەزاری لێ بە قەرز برد ، پاشان كاتێك گەڕایەوە قەرزەكەی دایەوە بە خاوەنەكەی و ئەنجا پێی ووت : **خوا بەرەكەت بخاتە ناو ماڵ و منداڵتەوە و بەڕاستی پاداشتی قەرز تەنها بریتی‌یە لە دانەوەی و سوپاس كردن .**

*** داوا كردنەوەی قەرز بە چاكە** (حُسْنُ الـمُطالَبة)**:**

عَنِ ابْنِ عُمَرَ وَعَائِشَةَ (ﷺ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((مَنْ طَلَبَ حَقًّا فَلْيَطْلُبْهُ فِي عَفَافٍ وَافٍ أَوْ غَيْرِ وَافٍ))[٤٢].

واتە : هەر كەسێك داوای حەقێكی خۆیی كردەوە ئەوا با داوای بكاتەوە بە جوانی و پاكی و حەڵاڵی : بە تەواوی دایەوە یان بە ناتەواوی .

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ لِصَاحِبِ الْحَقِّ : ((خُذْ حَقَّكَ فِي عَفَافٍ وَافٍ أَوْ غَيْرِ وَافٍ))[٤٣].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە خاوەن حەقی فەرموو : حەقەكەت ببەرەوە بە پاكی و حەڵاڵی : تەواو بوو یان ناتەواو بوو .

---

[٤١] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤٢٤) وصحيح الترغيب والترهيب رقم : (١٧٥٧) .

[٤٢] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤٢١) .

[٤٣] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤٢٢) .

کەواتە : ئەگەر قەرزارەکە خیانەتکار بوو ئەوا دەبێت خاوەن قەرزەکە تەنها حەقەکەی خۆی بباتەوە ﴿تەواو بوو یان ناتەواو بوو﴾ ، بەڵام نابێت ئەویش خیانەت لەو قەرز کوێر و سفڵەیە بکات چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ ، وَلاَ تَخُنْ مَنْ خَانَكَ))[٤٤] .

واتە : ئەو ئەمانەتەی کە لە لاتە بیدەرەوە بە خاوەنەکەی ، وە خیانەت لە کەسێکیش مەکە کە خیانەتی لێ کردوویت .

*** گواستنەوەی قەرز بۆ سەر کەسێکی تر (الحَوالَة):**

الـحَـوالَـة : هـي (نَـقْلُ الدَّيْنِ مِنْ ذِمَّـةٍ إِلَـى ذِمَّـةٍ)[٤٥] .

**گواستنەوەی قەرز** : بریتییە لە گواستنەوەی قەرز لە گەردنی کەسێکەوە بۆ سەر گەردنی کەسێکی تر .

ئەگەر قەرزت بە لای کەسێکەوە هەبوو .. ئەویش قەرزی بە لای کەسێکی ترەوە هەبوو .. وە لە کاتی داوا کردنەوەی قەرزەکەتدا ووتی بڕۆ قەرزەکەت لە لای (فڵانە کەس) وەربگرەوە چونکە منیش قەرزم لە لایەتی : ئەوا ئەگەر ئەو (فڵانە کەس)ـە بە توانا و دەست ڕۆیشتوو بوو .. وە قەرز کوێر و پارە خۆر نەبوو دەبێت بڕۆیت داوای قەرزەکەت لەو (فڵانە کەس)ـە بکەیتەوە و قەرزەکەت دەگوازرێتەوە بۆ لای ئەو .

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ ، فَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيٍّ فَلْيَتْبَعْ))[٤٦] .

واتە : دوا خستنی بردنەوەی قەرز لە لایەن کەسێکەوە کە دەستی بچێت و بتوانێت قەرزەکە بداتەوە ستەم و زوڵمە ، وە ئەگەر قەرزی یەکێك لە ئێوە گواسترایەوە بۆ سەر کەسێکی بە توانا و دەست ڕۆیشتوو ئەوا با قەرزەکەی بگوێزێتەوە .

---

[٤٤] صحيح سنن أبـي داود رقم : (٣٥٣٥) وصحيح سنن الترمذي رقم : (١٢٦٤) .

[٤٥] انظر : فتح الباري : (٤ / ٥٨٥) وفـقهُ السنة : (٣ / ٢٢٤ ــ ٢٢٥) .

[٤٦] صحيح البخاري رقم : (٢٢٨٧) وصحيح مسلم رقم : (١٥٦٤) .

*** بردنی پارەی خەڵك بە نیەتی دانەوەی یان خواردنی:**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ : ((مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ النَّاسِ يُرِيدُ أَدَاءَهَا أَدَّى اللَّـهُ عَنْهُ ، وَمَنْ أَخَذَ يُرِيدُ إِتْلَافَهَا أَتْلَفَهُ اللَّهُ))[٤٧].

واتە : هەر كەسێك پارە و ماڵی خەڵك ببات بە نیەت و مەبەستی دانەوەی ئەوا خوای گەورە بۆی دەداتەوە ، وە هەر كەسێكیش پارە و ماڵی خەڵك ببات بە نیەت و مەبەستی نەدانەوەی ئەوا خوای گەورە لە ناوی دەبات .

زانایان فەرموویانە مەبەست بەوەی كە خوای گەورە بۆی دەداتەوە بریتیـیە لە دوو شت :

ـ خوای پەروەردگار كاری بۆ ئاسان دەكات و بەرەكەت دەخاتە ناو ئیش و كاریەوە تاوەكو بتوانێت قەرزەكە بداتەوە .

ـ ئەگەر مرد و قەرزەكەی بە سەر مایەوە بە هۆی نەداری و دەست كورتـیـیەوە ئەوا خوای گەورە خۆی بۆی دەبژێرێت بەوەی كە ئەوەندە پاداشتی خاوەن قەرزەكە دەداتەوە تاوەكو ڕازی دەبێت .

هەروەها فەرموویانە مەبەست بەوەی كە خوای گەورە لە ناوی دەبات بریتیـیە لە دوو شت :

ـ یان لە ناوبردنەكەی لە دونیادا دەبێت ، بەوەی كە بژێوی یان خۆی لە ناوببات .

ـ وە یان لە ناوبردنەكەی لە دواڕۆژدا دەبێت بەوەی كە سزای بدات و تۆڵەی خاوەن قەرزەكەی لێبسێنێتەوە .

قال الحافظ : (... نَطَقَ الْحَدِيثُ بِأَنَّ اللَّهَ يُؤَدِّي عَنْهُ إِمَّا بِأَنْ يَفْتَحَ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا ، وَإِمَّا بِأَنْ يَتَكَفَّلَ عَنْهُ فِي الْآخِرَةِ ...

قَوْلُهُ : "أَتْلَفَهُ اللَّه" : ظَاهِرُهُ أَنَّ الْإِتْلَافَ يَقَعُ لَهُ فِي الدُّنْيَا وَذَلِكَ فِي مَعَاشِهِ أَوْ فِي نَفْسِهِ ... وَقِيلَ الْمُرَادُ بِالْإِتْلَافِ عَذَاب الْآخِرَة .

قَالَ اِبْن بَطَّال : فِيهِ الْحَضُّ عَلَى تَرْك اِسْتِئْكَال أَمْوَال النَّاس وَالتَّرْغِيب فِي حُسْنِ التَّأْدِيَة إِلَيْهِمْ

---

[٤٧] صحيح البخاري رقم : (٢٣٨٧) .

عِنْدَ الْمُدَايَنَةِ وَأَنَّ الْجَزَاءَ قَدْ يَكُونُ مِنْ جِنْسِ الْعَمَلِ ...)[٤٨].

واتە : ئەم فەرموودەیە هاندانی تێدایە بۆ وازهێنان لە خواردنی پارە و ماڵی خەڵك ، و هاندانیشی تێدایە بۆ قەرزدانەوەی خەڵك بە چاکە لە کاتی قەرزکردندا ...

وَعَنْ صُهَيْبِ الْخَيْرِ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((أَيُّمَا رَجُلٍ يَدَيَّنُ دَيْنًا وَهُوَ مُجْمِعٌ أَنْ لاَ يُوَفِّيَهُ إِيَّاهُ لَقِيَ اللَّهَ سَارِقًا))[٤٩].

واتە : هەر پیاوێك قەرزێك بکات و مەبەست و نیەتی وابێت کە نەیداتەوە بە خاوەنەکەی ئەوا ئەو پیاوە کە دەگاتە خوای پەروەردگار بە **دز** دەژمێردرێت .

*** قەرزاری بە هۆی کارەساتەوە :**

ئەگەر کەسێك بە هۆی کارەساتێکەوە کەوتە ژێر قەرزەوە ئەوا پێویستە لە سەر موسڵمانان هاوکاری بکەن و تەنها ئەوەندەش دەبژێرێت کە لە توانایدا هەیە .

عَنْ أَبِي سَعِيد الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ : ((أُصِيبَ رَجُلٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي ثِمَارٍ ابْتَاعَهَا فَكَثُرَ دَيْنُهُ ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ ، فَتَصَدَّقَ النَّاسُ عَلَيْهِ فَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفَاءَ دَيْنِهِ ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِغُرَمَائِهِ : خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ وَلَيْسَ لَكُمْ إِلاَّ ذَلِكَ))[٥٠].

واتە : پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کارەساتێك هات بە سەریدا لە کڕینی بەروبوومێکدا بۆیە قەرزێکی زۆری کەوتە سەر ، لە بەر ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : خێر و صەدەقەی پێ بکەن و هاوکاری بکەن ، جا خەڵك خێریان پێ کرد و هاوکاریان کرد بەڵام ئەو خێرە بەشی قەرزەکەی بە تەواوی نەکرد ، دوای ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە خاوەن قەرزەکانی فەرموو : ئەوەی کە دەیبینن بیبەن و جگە لەمەش هیچی ترتان بۆ نییە .

قال النووي : (فِيهِ : التَّعَاوُن عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى ، وَمُوَاسَاة الْمُحْتَاج وَمَنْ عَلَيْهِ دَيْن ، وَالْحَثُّ عَلَى الصَّدَقَة عَلَيْهِ ، وَأَنَّ الْمُعْسِر لَا تَحِلُّ مُطَالَبَته وَلَا مُلَازَمَته وَلَا سِجْنه ... وَفِيهِ أَنْ يُسَلَّم إِلَى الْغُرَمَاء جَمِيع مَال الْمُفْلِس مَا لَمْ يَقْضِ دَيْنهمْ ، وَلَا يُتْرَك لِلْمُفْلِسِ سِوَى ثِيَابه وَنَحْوهَا)[٥١].

---

[٤٨] فتح الباري : (٥ / ٦٨ ـــ ٦٩) .
[٤٩] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤١٠) .
[٥٠] صحيح مسلم رقم : (١٥٥٦) .
[٥١] شرح صحيح مسلم : (١٠ / ٢١٧ ـــ ٢١٨) .

واتە : ئەم فەرموودەیە ئەوەی تێدایە کە :

- دەبێت هاوکاری یەکتر بکرێت لە سەر چاکەکاری و خۆپارێزی کردن لە تاوان و خراپەکاری .

- وە دەبێت هاوکاری و یارمەتی نەدار و قەرزار بکرێت و هاندانیشی تێدایە بۆ بەخشین و صەدەقە کردن بە نەدار و قەرزار .

- هەروەها قەرزاری نەدار و بێتوانا دروست و حەڵاڵ نییە داوای قەرزی لێبکرێتەوە و بە دوای بکەویت و بەند و سجنی بکەیت .

- وە هەروەها ئەوەشی تێدایە : کە هەموو ماڵ و سامانێکی ئەو کەسەی کە هیچی بە دەستەوە نەماوە (موفلس) دەدرێتە دەست خاوەن قەرزەکان تاوەکو قەرزیان بە سەریەوە مابێت و هیچیشی بۆ بە جێناهێڵن جگە لە جلوبەگ و هاوەشێوەکانی نەبێت لە پێداویستییە سەرەکییەکان .

## * ئایا زەکاتی قەرز دەدرێت یان نادرێت ؟

**پارە و ماڵ و سامانی بە قەرز دراو دەبێت بە دوو بەشەوە :**

١ - قەرزێك کە لە لای کەسێکە توانای دانەوەیی هەیە و ئومێدی دانەوەشی دەکەیت : ئەوا ئەم پارە و ماڵە دەبێت (خاوەن پارە و سامانەکە) زەکاتەکەی بدات بۆ هەموو ساڵێك .

٢ - قەرزێك کە لە لای کەسێکە توانای دانەوەیی نییە چونکە نەدار و دەست کورتە یان لە لای کەسێکی قەرز کوێرە و ئومێدی دانەوەی ناکەیت : ئەوا ئەم پارە و ماڵە زەکاتی تێدا نییە .

قال اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء برئاسة الشيخ ابن باز رحمهُ الله :

(إذا كان المَدين مُعْسِراً أو كان مليئاً لكنه مُماطِل ولا يمكن الدائن استخلاص دَينه منه ... فلا تجب الزكاة على الدائن حتى يَقبِضَ دَينَهُ ويستقبل به حولاً)[٥٢].

واتە : ئەگەر قەرزارەکە نەدار و دەست کورت و بێتوانا بوو یان ئەگەر توانای

---

[٥٢] فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث والإفتاء رقم الفتوى : (٩٠٦٩) .

هەبوو قەرزەكە بداتـەوە و دەسـت ڕۆیشتوو بـوو بـەڵام قـەرز كوێر و دواخـەر بـوو وە خاوەن قەرزەكەش نەیدەتوانی قەرزەكەی لێبسێنێتەوە و لە دەسی دەربكات ... ئـەوا زەكات دانی ئەو قەرزە واجب و پێویست نـیـيە لـە سـەر خـاوەن قەرزەكـە هـەتاوەكو قەرزەكەی وەردەگرێتەوە و ساڵیش بە سەریدا تێپەڕ دەبێت .

وە دەبێت ئەوەش بزانیت كەوا قەرزار زكاتی ئەوە قەرزە نـادات كـە لـە لایـەتی ، چونكە خاوەنی موڵك و سەروەت و سامان واجب و پێویستە لە سـەری زەكـاتی هـەموو ماڵ و سامانەكەی بدات بەوەیشەوە كە قەرزە لە سـەر قـەرزارێك كـە توانـای دانـەوەیی هەبێت و ئومێدی دانەوەشی لـێ بكرێت .

*** ئەگەر موسڵمانێكی نەدار و دەست كورت بە قـەرزاری مرد ئـەوا دەبێت لـە خەزینـەی دەوڵەت قەرزەكەی بۆ ببژێرێت :**

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((الدَّيْنُ دَيْنَانِ فَمَنْ مَـاتَ وَهُـوَ يَنْوِي قَضَاءَهُ فَأَنَا وَلِيُّهُ ، وَمَنْ مَاتَ وَلا يَنْوِي قَضَاءَهُ فَذَاكَ الَّذِي يُؤْخَذُ مِنْ حَسَنَاتِهِ لَيْسَ يَوْمَئِذٍ دِينَارٌ وَلا دِرْهَمٌ))[٥٣] .

واتـە : قـەرز دوو جۆرە : هـەر كەسێك بمرێـت بـە قـەرزاری و نیـەتی دانـەوەی قەرزەكەی بووبێت ئەوا من دەبمە خاوەنی و بۆی دەبژێرم لە (**بيتُ المال**) ، وە هـەر كەسێك بمرێت بە قەرزاری و نیەتی دانەوەی قەرزەكـەی نـەبووبێت ئـەوە ئـەو كەسـەیە كە بە ئەندازەی قەرزەكە لە كردەوە چاكەكانی دەبرێت چونكە لە ڕۆژی قیامەتدا دینـار و درهەم نیـيە .

*** دوا خستنی قەرز بردنەوە بۆ خاوەنەكەی ستەم و زوڵمە :**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ))[٥٤] .

واتـە : دوا خـستنی بردنـەوەی قـەرز لـە لایـەن كەسێكەوە كـە دەسـتی بـچێت و بتوانێت قەرزەكە بداتەوە [ئەگەر چی دەوڵەمەندیش نەبێت] ستەم و زوڵمە ...

---

[٥٣] صحيح الترغيب والترهيب رقم : (١٨٠٣) وصحيح الجامع الصغير رقم : (٣٤١٨) .

[٥٤] صحيح البخاري رقم : (٢٢٨٧) و (٢٤٠٠) وصحيح مسلم رقم : (١٥٦٤) .

وە ئەوەش بزانە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((الظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ...))[٥٥].

واتە : ستەم و زوڵم کردن تاریکییە لە ڕۆژی دوایدا .

وە زانایان فەرموویانە دواخستنی دانەوەی قەرز لە لایەن کەسێکەوە کە توانای هەبێت بیداتەوە و بەڵام کەم ترخەمی دەکات و بە بێ عوزر و بیانو دوای دەخات و ئەمڕۆ و بەیانی و پانزەی مانگ و سەری مانگ دەکات ئەوا یەکێك لە تاوانە گەورەکانی (الکبائر) ئەنجام داوە و پێی دەبێت بە (فاسق) و شکات کردن و بەند و سجن کردنی حەڵاڵ دەکات .

قال الحافظ ابن حجر : (قَوْلُهُ : "مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ" وَالْمَعْنَى أَنَّهُ مِنْ الظُّلْمِ ، وَأُطْلِقَ ذَلِكَ لِلْمُبَالَغَةِ فِي التَّنْفِيرِ عَنْ الْمَطْلِ ... وَالْغَنِيُّ مُخْتَلَف فِي تَعْرِيفه وَلَكِنْ الْمُرَاد بِهِ هُنَا مَنْ قَدَرَ عَلَى الْأَدَاء فَأَخَّرَهُ وَلَوْ كَانَ فَقِيراً ... وَالْمَعْنَى أَنَّهُ يَحْرُم عَلَى الْغَنِيّ الْقَادِر أَنْ يَمْطُل بِالدَّيْنِ بَعْد اسْتِحْقَاقه بِخِلَافِ الْعَاجِز ...

وَفِي الْحَدِيث : الزَّجْر عَنْ الْمَطْل ، وَاخْتُلِفَ هَلْ يُعَدُّ فِعْله عَمْداً كَبِيرَة أَمْ لَا ؟ فَالْجُمْهُور عَلَى أَنَّ فَاعِله يَفْسُق ... وَاسْتُدِلَّ بِهِ عَلَى أَنَّ الْعَاجِز عَنْ الْأَدَاء لَا يَدْخُل فِي الظُّلْم ... وَاسْتُنْبِطَ مِنْهُ أَنَّ الْمُعْسِر لَا يُحْبَس وَلَا يُطَالَب حَتَّى يُوسِر ... )[٥٦].

*** دوا خستنی قەرز بردنەوە بۆ خاوەنەکەی غەیبەت کردن و سزادانی قەرزارەکە حەڵاڵ دەکات :**

ئەگەر کەسێکی قەرزار توانای هەبوو ئەو قەرزەی کە لە لایەتی بیداتەوە و نەیدایەوە و ئەمڕۆ و بەیانی دەکرد و دوای دەخست بە بێ عوزر ئەوا دروستە بۆ خاوەن قەرزەکە غەیبەتی قەرزارەکە بکات و بڵێت ستەم و زوڵمی لێم کردووە و دروستیشە شکاتی بکات و حەبس و زیندانی و بەندی بکات و تۆڵەی خۆیی لێبسێنێتەوە ، هەروەها دروستیشە خەڵکانی تری لێئاگادار بکاتەوە بۆ ئەوەی پارە و ماڵی خۆیانی نەدەنێ بە قەرز .

---

[٥٥] صحيح البخاري رقم : (٢٤٤٧) وصحيح مسلم رقم : (٢٥٧٩) .

[٥٦] انظر : فتح الباري شرح صحيح البخاري : (٤ / ٥٨٦ ــ ٥٨٨) .

عَنْ الشَّرِيدِ بْنِ سُوَيْدٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ))[٥٧].

واتە : ئەو كەسەى كە تواناى هەيە قەرز بداتەوە بەڵام نايداتەوە و دواى دەخات ئەمە غەيبەت كردن و سومعەت شكاندن و سزا دان و تۆڵە لێسەندنەوەى حەڵاڵ دەكات .

قال العلماء : "يُحِلُّ عِرْضَهُ" : أي شكايته بأن يقول ظلمني أو يُحذر غيرهُ منهُ كي لا يعطوهُ أموالهم .

وعقوبته : أي سجنه وحبسهُ وتعزيرهُ .

وقال الحافظ : (وَاسْتُدِلَّ بِهِ عَلَى مَشْرُوعِيَّةِ حَبْسِ الْمَدِينِ إِذَا كَانَ قَادِراً عَلَى الْوَفَاءِ تَأْدِيباً لَهُ وَتَشْدِيداً عَلَيْهِ ، وَبِقَوْلِهِ : "الْوَاجِد" عَلَى أَنَّ الْمُعْسِرَ لَا يُحْبَس)[٥٨].

*** نووسينى قەرز و شايەت گرتن لە سەرى :**

خواى پەروەردگار لە درێژترين ئايەتى قورئانى پيرۆزدا فەرمانى بە ئيمانداران كردووە كەوا ئەگەر قەرزێكيان دا بە كەسێك بۆ ماوەيەك ئەوا باشتر و چاكتر وايە بينووسن و دوو كەسيش بكەن بە شايەت لە سەر ئەو قەرزە كەم بێت يان زۆر بێت :

قال الله تعالى : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ وَلَا يَأۡبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْۚ وَلَا تَسۡـَٔمُوٓاْ أَن تَكۡتُبُوهُ صَغِيرًا أَوۡ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦۚ

---

[٥٧] صحيح سنن أبي داود رقم (٣٦٢٨) وصحيح سنن النسائي رقم : (٤٦٨٩) ، وقد رواهُ البخاري تعليقاً في صحيحه انظر الفتح : (٥ / ٧٨) .

[٥٨] فتح الباري : (٥ / ٧٨) .

ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓا۟ ۖ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا ۗ وَأَشْهِدُوٓا۟ إِذَا تَبَايَعْتُمْ ۚ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ ۚ وَإِن تَفْعَلُوا۟ فَإِنَّهُۥ فُسُوقٌۢ بِكُمْ ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٨٢﴾ ﴾ [البقرة] .

قال الحافظ ابن كثير : (هذه الآية الكريمة أطول آية في القرآن العظيم ...

فقوله : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَٱكْتُبُوهُ ۚ﴾ هذا إرشاد منه تعالى لعباده المؤمنين إذا تعاملوا بمعاملات مؤجلة أن يكتبوها ليكون ذلك أحفظ لمقدارها وميقاتها وأضبط للشاهد فيها ، وقد نبه على هذا في آخر الآية حيث قال : ﴿ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓا۟ ۖ﴾ ... وقوله : ﴿فَٱكْتُبُوهُ﴾ أمر منه تعالى بالكتابة للتوثقة والحفظ ... فأمروا أمر إرشاد لا أمر إيجاب كما ذهب إليه بعضهم ... وقال أبو سعيد والشعبي والربيع بن أنس والحسن وابن جريج وابن زيد وغيرهم كان ذلك واجباً ثُمَّ نسخ بقوله : ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ﴾ والدليل على ذلك أيضاً الحديث الذي حكى عن شرع من قبلنا مقرراً في شرعنا ولم ينكر عدم الكتابة والإشهاد ... عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) : ((أَنَّهُ ذَكَرَ أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ سَأَلَ بَعْضَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يُسْلِفَهُ أَلْفَ دِينَارٍ ، فَقَالَ : ائْتِنِي بِالشُّهَدَاءِ أُشْهِدُهُمْ ، فَقَالَ : كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا ، قَالَ : فَأْتِنِي بِالْكَفِيلِ ، قَالَ : كَفَى بِاللَّهِ كَفِيلاً ، قَالَ صَدَقْتَ ، فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى ...))[٥٩] وهذا إسناد صحيح وقد رواه البخاري بسبعة مواضع من طرق صحيحة معلقا بصيغة الجزم ...

وقوله تعالى : ﴿وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌۢ بِٱلْعَدْلِ ۚ﴾ أي بالقسط والحق ولا يجر في كتابته على أحد ولا يكتب إلا ما اتفقوا عليه زيادة ولا نقصان .

وقوله : ﴿وَلَا يَأْبَ كَاتِبٌ أَن يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُ ۚ﴾ فليكتب أي ولا يمتنع من يعرف الكتابة إذا سئل أن يكتب للناس ولا ضرورة عليه في ذلك ، فكما علمه الله ما لم يكن

[٥٩] صحيح البخاري رقم : (١٤٩٨) و (٢٠٦٣) و (٢٢٩١) و (٢٤٠٤) و (٢٤٣٠) و (٢٧٣٤) و (٦٢٦١) .

يعلم فليتصدق على غيره ممن لا يحسن الكتابة وليكتب ...وقال مجاهد وعطاء واجب على الكاتب أن يكتب .

وقوله : ﴿وَلْيُمْلِلِ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ﴾ أي وليملل المدين على الكاتب ما في ذمته من الدين وليتق الله في ذلك ، ﴿وَلَا يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْـًٔا﴾ أي لا يكتم منه شيئاً ، ﴿فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ سَفِيهًا﴾ محجوراً عليه بتبذير ونحوه ﴿أَوْ ضَعِيفًا﴾ أي صغيرا أو مجنوناً ﴿أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ﴾ أما لعي أو جهل بموضع صواب ذلك من خطأه ﴿فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُۥ بِٱلْعَدْلِ﴾ .

وقوله : ﴿وَٱسْتَشْهِدُوا۟ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ﴾ أمر بالإشهاد مع الكتابة لزيادة التوثقة ﴿فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ﴾ وهذا إنما يكون في الأموال وما يقصد به المال ، وإنما أقيمت المرأتان مقام الرجل لنقصان عقل المرأة ... كما قال مسلم في صحيحه عن أبي هريرة عن النبي (ﷺ) أنه قال : ((...أَمَّا نُقْصَانُ الْعَقْلِ فَشَهَادَةُ امْرَأَتَيْنِ تَعْدِلُ شَهَادَةَ رَجُلٍ فَهَذَا نُقْصَانُ الْعَقْلِ))[٦٠] .

وقوله : ﴿مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ﴾ فيه دلالة على اشتراط العدالة في الشهود ...

وقوله : ﴿أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ﴾ أن تضل إحداهما يعني المرأتين إذا نسيت الشهادة فتذكر إحداهما الأخرى أي يحصل لها ذكر بما وقع به من الإشهاد ...

وقوله : ﴿وَلَا تَسْـَٔمُوٓا۟ أَن تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦ﴾ هذا من تمام الإرشاد وهو الأمر بكتابة الحق صغيرا كان أو كبيرا فقال ولا تسأموا أي لا تملوا أن تكتبوا الحق على أي حال كان من القلة والكثرة إلى أجله .

وقوله : ﴿ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓا۟﴾ أي هذا الذي أمرناكم به من الكتابة للحق إذا كان مؤجلاً هو أقسط عند الله أي أعدل وأقوم للشهادة أي أثبت للشاهد إذا وضع خطه ثم رآه تذكر به الشهادة لاحتمال أنه لو لم يكتبه أنْ ينساهُ كما هو الواقع غالباً ، وأدنى أنْ لا ترتابوا وأقرب إلى عدم الريبة بل ترجعون عند التنازع إلى الكتاب

---

[٦٠] صحيح البخاري رقم : (٣٠٤) وصحيح مسلم رقم : (٧٩) واللفظ له .

الذي كتبتموه فيفصل بينكم بلا ريبة .

وقوله : ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا﴾ أي إذا كان البيع بالحاضر يدا بيد فلا بأس بعدم الكتابة لا نتفاء المحذور في تركها .

فأما الاشهاد على البيع فقد قال تعالى : ﴿وَأَشْهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾ قال ابن أبي حاتم ... روي عن جابر بن زيد ومجاهد وعطاء والضحاك نحو ذاك وقال الشعبي والحسن هذا الأمر منسوخ بقوله : ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ﴾ .

وهذا الأمر محمول عند الجمهور على الإرشاد والندب لا على الوجوب ، والدليل على ذلك حديث خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتِ الأَنْصَارِيِّ (ﷺ) :

وقد رواه الإمام أحمد حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ حَدَّثَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ حَدَّثَنِي عُمَارَةُ بْنُ خُزَيْمَةَ الأَنْصَارِيُّ أَنَّ عَمَّهُ حَدَّثَهُ وَهُوَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) : «أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) ابْتَاعَ فَرَساً مِنْ أَعْرَابِيٍّ فَاسْتَتْبَعَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) لِيَقْضِيَهُ ثَمَنَ فَرَسِهِ فَأَسْرَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) الْمَشْيَ وَأَبْطَأَ الأَعْرَابِيُّ فَطَفِقَ رِجَالٌ يَعْتَرِضُونَ الأَعْرَابِيَّ فَيُسَاوِمُونَ بِالْفَرَسِ لاَ يَشْعُرُونَ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) ابْتَاعَهُ حَتَّى زَادَ بَعْضُهُمُ الأَعْرَابِيَّ فِي السَّوْمِ عَلَى ثَمَنِ الْفَرَسِ الَّذِي ابْتَاعَهُ بِهِ النَّبِيُّ (ﷺ) .

فَنَادَى الأَعْرَابِيُّ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ : إِنْ كُنْتَ مُبْتَاعاً هَذَا الْفَرَسَ فَابْتَعْهُ وَإِلاَّ بِعْتُهُ .

فَقَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) حِينَ سَمِعَ نِدَاءَ الأَعْرَابِيِّ فَقَالَ : أَوَلَيْسَ قَدِ ابْتَعْتُهُ مِنْكَ ؟

قَالَ الأَعْرَابِيُّ : لاَ وَاللَّهِ مَا بِعْتُكَ .

فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : بَلَى قَدِ ابْتَعْتُهُ مِنْكَ ، فَطَفِقَ النَّاسُ يَلُوذُونَ بِالنَّبِيِّ (ﷺ) وَالأَعْرَابِيِّ وَهُمَا يَتَرَاجَعَانِ .

فَطَفِقَ الأَعْرَابِيُّ يَقُولُ : هَلُمَّ شَهِيداً يَشْهَدُ أَنِّي بَايَعْتُكَ .

فَمَنْ جَاءَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ قَالَ لِلأَعْرَابِيِّ : وَيْلَكَ إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمْ يَكُنْ لِيَقُولَ إِلاَّ حَقّاً .

حَتَّى جَاءَ خُزَيْمَةُ فَاسْتَمَعَ لِمُرَاجَعَةِ النَّبِيِّ (ﷺ) وَمُرَاجَعَةِ الأَعْرَابِيِّ ، فَطَفِقَ الأَعْرَابِيُّ يَقُولُ : هَلُمَّ شَهِيداً يَشْهَدُ أَنِّي بَايَعْتُكَ .

قَالَ خُزَيْمَةُ : أَنَا أَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَايَعْتَهُ .

فَأَقْبَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى خُزَيْمَةَ فَقَالَ : بِمَ تَشْهَدُ ؟

فَقَالَ : بِتَصْدِيقِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ .

فَجَعَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) شَهَادَةَ خُزَيْمَةَ شَهَادَةَ رَجُلَيْنِ»[٦١]

... ولكن الإحتياط هو الإشهاد لما رواه الإمامان الحافظ أبو بكر بن مردويه والحاكم في مستدركه ... عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ : «ثَلاثَةٌ يَدْعُونَ فَلا يُسْتَجَابُ لَهُمْ : رَجُلٌ كَانَتْ لَهُ امْرَأَةٌ سَيِّئَةُ الْخُلُقِ فَلَمْ يُطَلِّقْهَا ، وَرَجُلٌ دَفَعَ مَالَ يَتِيمٍ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغَ ، وَرَجُلٌ أَقْرَضَ رَجُلاً مَالاً فَلَمْ يُشْهِدْ عَلَيْهِ»[٦٢] ...) اهـ .

*** وەرگرتنی ڕەهن لە بەرامبەر قەرزدا :**

**ئەگەر پارەیەك یان شتێك دا بە كەسێك بە قەرز ئەوا دروستە لە بەرامبەر ئەوەدا ڕەهنی لێ وەربگریت تاوەكو قەرزەكەت بۆ دێنێتەوە :**

**خـوای پـەروەردگار فەرموویـەتی :** ﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ ۖ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ ۗ وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ ۚ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨٣﴾﴾ [البقرة] .

**واتە : ئەگەر لە سەفەردا بوون و نووسەرتان نەدۆزیەوە قەرزەكە لە نێوانتاندا بنووسێت ئەوا با ڕەهنێكی لێ وەربگرێت ، وە ئەگەر هەندێكتان ئەمین بوون لە هەندێكتان ئەوا با ئەوەی ئەمانەتەكەی لایە بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەكەی و لە خوای پەروەردگاری بترسێت ، وە شایەتی مەشارنەوە و هەركەسێك بیشارێتەوە ئەوا دڵی تاوانبارە و خواش بە كردەوەكانتان زانایە .**

قال الحافظ ابن كثير : (يقول تعالى : ﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ أي مسافرين وتداينتم إلى

---

[٦١] مسند أحمد رقم : (٢٢٥٢٢) وصحيح سنن أبي داود رقم : (٣٦٠٧) وصحيح سنن النسائي رقم : (٤٦٤٧) .

[٦٢] هذا الحديث أخرجهُ مُحدثُ عصره الإمام الألباني بهذا اللفظ : «ثَلاثَةٌ يَدْعُونَ فَلا يُسْتَجَابُ لَهُمْ : رَجُلٌ كَانَتْ تَحْتَهُ امْرَأَةٌ سَيِّئَةُ الْخُلُقِ فَلَمْ يُطَلِّقْهَا ، وَرَجُلٌ كَانَ لَهُ عَلَى رَجُلٍ مَالٌ فَلَمْ يُشْهِدْ عَلَيْهِ ، وَرَجُلٌ آتَى سَفِيهًا مَالَهُ ، وَقَدْ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ : ﴿وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ﴾» [سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٨٠٥) و صحيح الجامع الصغير رقم : (٣٠٧٥)] .

أجل مسمى ﴿وَلَمۡ تَجِدُواْ كَاتِبٗا﴾ يكتب لكم ، قال ابن عباس : أو وجدوه ولـم يـجدوا قرطاساً أو دواةً أو قلماً فرهن مقبوضة أي فليكن بدل الكتابة رهانٌ مقبوضة أي في يد صاحب الحق ...

وقال الشعبي : إذا ائتمن بعضكم بعضا فلا بأس أن لا تكتبوا أو لا تشهدوا ...) .

وَعَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ : ((أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) اشْتَرَى مِنْ يَهُودِيٍّ طَعَامًا إِلَى أَجَلٍ وَرَهَنَهُ دِرْعَهُ))[٦٣].

**واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) خواردنی لە جوولەکەیەك کڕی بە قەرز بۆ ماوەیەك و قەڵغانەکەی کرد بە ڕەهن لە لای .**

## * قەرزدانەوە پێش دەخرێت بە سەر بە جێگەیاندی وەصیێت و میرات دابەش کردن :

عَنْ عَلِيٍّ (رضي الله عنه) قَالَ : ((قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِالدَّيْنِ قَبْلَ الْوَصِيَّةِ))[٦٤].

**واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڕیاری داوە و فەرمانی کردووە بەوەی کەوا : دوای مردن قەرزدانەوە پێش دەخرێت بە سەر جێبەجێ کردنی وەصیێتی مردوو .**

وَعَنْ سَعْدِ بْنِ الأَطْوَلِ (رضي الله عنه)قَالَ : ((أَنَّ أَخَاهُ مَاتَ وَتَرَكَ ثَلاَثَمِائَةِ دِرْهَمٍ وَتَرَكَ عِيَالاً ، فَأَرَدْتُ أَنْ أُنْفِقَهَا عَلَى عِيَالِهِ ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : إِنَّ أَخَاكَ مُحْتَبَسٌ بِدَيْنِهِ فَاقْضِ عَنْهُ ، فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ أَدَّيْتُ عَنْهُ إِلاَّ دِينَارَيْنِ ادَّعَتْهُمَا امْرَأَةٌ وَلَيْسَ لَهَا بَيِّنَةٌ ، قَالَ : فَأَعْطِهَا فَإِنَّهَا مُحِقَّةٌ))[٦٥].

**واتە : براکەم مرد و سێسەد (٣٠٠) درهەمی بە میراتی و خێزانێکیشی بەجێهێشت ، منیش ویستم ئەو پارەیە بدەم بە شتومەك و پێداویستی پێ بکڕم بۆ خێزانەکەی ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : براکەت بەند کراوە بە هۆی قەرزەکەیەوە بۆیە قەرزەکەی بدەرەوە ، ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا هەموو قەرزەکەم بۆ دایەوە**

---

[٦٣] صحيح البخاري رقم : (٢٥٠٩) وصحيح مسلم رقم : (١٦٠٣) .

[٦٤] صحيح سنن الترمذي رقم : (٢١٢٢) وصحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٧١٥) .

[٦٥] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤٣٣) .

تەنها دوو دینار نەبێت كەوا ئافرەتێك داخوازی دەكات و بەڵگەشی نییە ، فەرمووی : بیدەرێ چونكە ئەو لە سەر حەقە و ڕاست دەكات .

قال الحافظ ابن عبد البر : (وفي حديث هذا الباب معانٍ من الفقه : منها أنَّ الورثةَ لا يُنفَق عليهم ولا لهم ميراثٌ حتى يُؤدَّي الدين ...)[٦٦].

## * چ كاتێك قەرزدان دەبێت بە ڕیبا ؟

١ ـ ئەگەر قەرزدەر (الدائن) مەبلەغێك پارە یان ماڵێك بە قەرز بدات بە كەسێكی تر (المديون) **بە مەرجێك** لە بەرامبەر دوا خستنی هێنانەوەی قەرزەكە مەبلەغێكی زیاتر یان جۆرێكی چاكتر یان شتێكی زیاتری بۆ بێنێت ، ئەوا ئەم جۆرە مامەڵەیە دەبێت بە (ڕیبا) و لە شەرعدا پێی دەوترێت : [ربا الفضل].

بۆ نموونە :

أ ـ (١٠٠,٠٠٠) دینار بە قەرز دەبات **بە مەرجێك** لە بەرامبەر ئەمەدا (١١٠,٠٠٠) بداتەوە بە خاوەنەكەی[٦٧].

---

[٦٦] التمهيد : (٢٣ / ٢٣٧) .

[٦٧] تێبینی : ئەم حاڵەتەیان ئەگەر قەرزیشی تێدا نەبێت ئەوا هەر دەبێت بە ڕیبا ئەگەر ئەو دوو شتەی كەوا ئاڵوگۆڕی پێدەكرێت بریتی بێت لە : (زێڕ و زیو و پارە و گەنم و جۆ و خورما و خوێ) چونكە مەرجە گۆڕینەوەكە دەست بە دەست بێت و بە هیچ شێوەیەك قەرزی تێدا نەبێت ئەگەر لە یەك جنس بن ، بۆ نموونە :

ـ (زێڕ و زیو و پارە) ئەگەر بە یەكتر گۆڕرانەوە (زێڕ بەرامبەر بە زێڕ بێت ، یان زێڕ بەرامبەر بە زیو بێت ، یان زێڕ بەرامبەر بە پارە بێت ، یان پارە بەرامبەر بە پارە بێت) ئەوا نابێت بە هیچ شێوەیەك قەرزی تێدا ببێت بەڵكو دەبێت دەست بە دەست بێت .

ـ (گەنم و جۆ) ئەگەر بە یەكتر گۆڕرانەوە (گەنم بەرامبەر بە جۆ بێت ، یان گەنم بەرامبەر بە گەنم بێت ، یان جۆ بەرامبەر بە جۆ بێت) ئەوا نابێت بە هیچ شێوەیەك قەرزی تێدا ببێت بەڵكو دەبێت دەست بە دەست بێت .

ـ (خورما بەرامبەر بە خورما) ئەگەر گۆڕرایەوە ئەوا نابێت بە هیچ شێوەیەك قەرزی تێدا ببێت بەڵكو دەبێت دەست بە دەست بێت .

ب ـ (١٠٠,٠٠٠) دینار [لە جۆر و فیئەی یەك هەزاری] بە قەرز دەبات **بە مەرجێك** لە بەرامبەر ئەمەدا (١٠٠,٠٠٠) دینار [لە جۆر و فیئەی بیست و پێنج هەزاری] بداتەوە بە خاوەنەكەی .

ج ـ (١٠٠,٠٠٠) دینار بە قەرز دەبات **بە مەرجێك** لە بەرامبەر ئەمەدا (١٠٠,٠٠٠) دینار و شتێكی زیاتری بۆ بێنێت وەك دوو مریشك یان چاكەیەكی بۆ بكات وەك ئەوەی بڵێت : ئەم قەرزەت پێ دەدەم **بە مەرجێك** خانووەكەت بدەیت پێم بە كرێ یان بە ئۆتۆمبیلەكەت لە گەڵ خۆتدا بمبەیت بۆ بازاڕ بۆ نموونە ...

دەتوانین ئەمەش تێبگەین لە ڕوانگەی ئەم بنچینە و بنەمایەوە كە لە بابەتی (قەرز و ریـــبا)دا باسكراوە :

زانایان فەرموویانە : (كُـلُّ قرضٍ جَـرَّ نَـفْـعاً فـهو ربا) .

واتە : هەموو قەرزێك سوودێكی **بە مەرج گیراو** لە گەڵ خۆیدا بێنێت بۆ خاوەنەكەی ئەوە ریـــبایە .

عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى قَالَ : أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ فَلَقِيتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَلاَمٍ (ﷺ) فَقَالَ : ((إِنَّكَ بِأَرْضِ الرِّبَـا بِهَا فَاشٍ ، إِذَا كَانَ لَكَ عَلَى رَجُلٍ حَقٌّ فَأَهْدَى إِلَيْكَ حِمْلَ تِبْنٍ أَوْ حِمْلَ شَعِيرٍ أَوْ حِمْلَ قَتٍّ ، فَلاَ تَأْخُذْهُ فَإِنَّهُ رِبـاً ، [وَإِنَّ مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا أَنَّ أَحَدَكُمْ يَقْرِضُ الْقَرْضَ إِلَى أَجَلٍ فَإِذَا بَلَغَ أَتَاهُ بِهِ وَبِسَلَّةٍ فِيهَا هَدِيَّةٌ فَاتَّقِ تِلْكَ السَّلَّةَ وَمَا فِيهَا]))[٦٨].

واتە : هاتم بۆ مەدینە و لەوێ گەیشتم بە (عبد الله بن سلام ﷺ) و پێی ووتم : تۆ لە ناو زەوییەكدا نیشتەجێت كە ریبا تێیدا بەربڵاوە ، جا ئەگەر حەق و قەرزێكت بە سەر پیاوێكەوە بوو و ئەویش بارێك كا یان بارێك جۆ یان بارێك عەلەفی بە دیاری بۆت

---

ـ (خوێ بەرامبەر بە خوێ) ئەگەر گۆڕرایەوە ئەوا نابێت بە هیچ شێوەیەك قەرزی تێدا هەبێت بەڵكو دەبێت دەست بە دەست بێت .

بەڵام ئەگەر گۆڕینەوەكە بە دوو شتی جیاواز بوو لە (جنس)دا وەك (زێڕ بەرامبەر بە گەنم ، یان پارە بەرامبەر بە جۆ ، یان گەنم بەرامبەر بە خورما ، یان خورما بەرامبەر بە زێڕ) ئەوا ئەم ئاڵوگۆڕە نابێت بە ریبا و هیچی تێدا نییە .

[٦٨] صحيح البخاري رقم : (٣٨١٤) والبيهقي رقم : (١٠٧٠٨) والزيادة لـهُ .

هێنا ئەوا وەرینەگریت چونکە ئەوە ریبایە ، وە یەکێك لە درگاکانی ریبا بریتی‌یە لەوەی کە یەکێك لە ئێوە قەرزێك دەدات بۆ ماوەیەك ، کاتێك ماوەکە تەواو دەبێت قەرزەکە دەهێنێتەوە لە گەڵ سەبەتەیەکدا کە دیاری‌یەکی تێدایە جا تۆ خۆت بپارێزە لەو سەبەتەیە و ئەوەش کە تێیدایە .

بوَّبَ الإمام البيهقي في كتابه "السنن الكبرى" لهذا الحديث بقوله : (كُلُّ قَرْضٍ جَرَّ مَنْفَعَةٍ فَهُوَ رِبًا) .

وقال الحافظ ابن حجر : (قَوْلُهُ : "إِنَّكَ فِي أَرْضٍ" يَعْنِي أَرْض الْعِرَاق ، "الرِّبَا بِهَا فَاشٍ" أَيْ شَائِع ... قَوْلُهُ : "حِمْل قَتّ" وَهُوَ عَلَف الدَّوَابّ .

قَوْلُهُ : "فَإِنَّهُ رِبًا" : يَحْتَمِل أَنْ يَكُون ذَلِكَ رَأْي عَبْد اللَّه بْن سَلَام ، وَإِلَّا فَالْفُقَهَاء عَلَى أَنَّهُ إِنَّمَا يَكُون رِبًا إِذَا شَرَطَهُ ، نَعَمْ الْوَرَع تَرْكُهُ)[٦٩] .

واتە : لەوانەیە ئەوە بۆچوونی (عبد الله بن سلام) بێت ، ئەگینا زانایان لە سەر ئەوەن کاتێك ئەوە دەبێت بە ریبا کە **بە مەرج بگیرێت** ، بەڵێ خۆپارێزی کردن لەوەدایە کە وازی لێبێنیت و وەرینەگریت .

کەواتە ئەگەر قەرزارەکە لە لایەن خۆیەوە لە قەرزەکە زیاتر یان باشتر بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی یان لە کاتی قەرزەکەدا یان لە دوای هێنانەوەی قەرزەکەدا شتێکی بە دیاری برد بۆ خاوەن قەرزەکە یان بە هەر چاکەیەك ویستی هەندێك پاداشتی خاوەن قەرزەکە بداتەوە ئەوا ئەمە نابێت بە ریبا چونکە ئەمە دەچێتە ژێر بابەتی (قەرزدانەوە بە چاکە) کە لە پێشەوە باسکرا چونکە لە سەرەتاوە بە مەرج نەگیراوە لە لایەن خاوەن قەرزەکەوە .

**٢ ــ پارە گۆڕینەوە بە قەرز دەبێت بە ریبا :**

**أ / کرین و فرۆشتن و گۆڕینەوەی پارە بە قەرز بە بێ زیادە .**

ئەگەر کرین و فرۆشتن و گۆڕینەوەی پارە بە قەرز بوو بە بێ‌زیادە ئەوا ئەم جۆرە مامەڵەیە دەبێت بە (ریبا) و لە شەرعدا پێی دەوترێت : [ربا النسيئة].

---

[٦٩] فتح الباري : (٧ / ١٦٦) .

وەك ئـەوەی کەسـێك سـەد (١٠٠) دۆلار بفرۆشـێت بـە کەسـێکی تـر و سـەد دۆلارەکەش بدات بە کابرای کڕیار بەرامبەر بە (١١٨,٠٠٠) دینار ، بەڵام کابرای کڕیار دوای جیا بوونەوەی لە بفرۆشەکە لە (مەجلسی کڕین و فرۆشتنەکەدا) بە ماوەیەك (١١٨,٠٠٠) دینارەکە تەسلیم بە بفرۆشەکە بکات ، ئەگەر چی ئەو ماوەیە چەند کاتژمێرێکی کەمیش بێت .

ب / کڕین و فرۆشتن و گۆڕینەوەی پارە بە قەرز بە زیادەوە .

وەك ئەوەی کەسێك سەد (١٠٠) دۆلار بفرۆشێت بە کەسێکی تر بەرامبەر بە سەدوبیست هەزار (١٢٠,٠٠٠) دینار بە قەرز ، بەڵام ئەگەر بە نەقدی بیفرۆشێت ئەوا بە (١١٨,٠٠٠) دینار دەیدات .

واتە : ئەگەر کڕین و فرۆشتنەکە بە نەقدی بێت ئەوا سەد (١٠٠) دۆلار بە (١١٨,٠٠٠) دینارە ، بەڵام ئەگەر بە قەرز بیبات ئەوا بە (١٢٠,٠٠٠) سەدوبیست هەزار دینار پێی دەفرۆشیت ، دوو هەزار (٢,٠٠٠) دینار زیاتری لێوەردەگرێت لە بەرامبەر دوا خستنی هێنانەوەی (١١٨,٠٠٠) دینارەکە.

(١٠٠ دۆلار = ١١٨,٠٠٠ دینار) بە نەقدی .

(١٠٠ دۆلار = ١٢٠,٠٠٠ دینار) بە قەرز .

وە ئەم شێوازەش دوو جۆر ریبای لە خۆ گرتووە :

أ / ربا الفضل: ریبای زیادە ، چونکە دوو هەزار (٢,٠٠٠) دینار زیاتری لێ وەردەگرێت لە بەرامبەر دوا خستنی هێنانەوەی (١١٨,٠٠٠) دینارەکە .

ب / ربا النسیئة : ریبای دوا خستن ، چونکە کڕین و فرۆشتنی پارەکە بە قەرز بوو .

**بەڵگەش لە سەر ئەمە :**

عَنْ الْمِنْهَالِ قَالَ : سَأَلْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ وَزَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ (رضي الله عنهما) عَنِ الصَّرْفِ ، ... فَكِلَاهُمَا يَقُولُ : ((نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ بَيْعِ الذَّهَبِ بِالْوَرِقِ دَيْنًا))[٧٠].

---

[٧٠] صحيح البخاري رقم : (٢١٨٠ ــ ٢١٨١) .

واتە : پرسیارم كرد لە دوو صەحابەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (البراء بن عازب وزید بن أرقم ﷺ) دەربارەی پارەگۆڕینەوە (**الصرف**) ... جا هەردووكیان فەرموویان : پێغەمبەری خوا (ﷺ)كڕین و فرۆشتنی دینار (زێڕ) بە درهەم (زیو)ی قەدەغە كردووە .

فهذا الــحديث دليل صريح على تحريم بيع عملة بعملة أخرى ديناً .

قال ابن دقيق العيد في ((إحكام الأحكام)) : ((وهو نصٌ في تحريـــم ربا النسيئة فيما ذكر فيه ، وهو الذهب بالوَرِق ، **لاجتماعهما في علة واحدة : وهي النقدية**))[٧١].

واتە : ئەم فەرموودەیە دەقێكی ڕوونە بۆ حەرامێتی ریبای قەرز و دواخستن لەوەی كە تێیدا باس كراوە كە بریتی‌یە لە (دینار بە درهەم) ، چونكە هەردووكیان یەك دەگرنەوە لە یەك هۆدا كە بریتی‌یە لەوەی هەردووكیان (**پارە و نرخ و دراون**) .

وفــي رواية أخرى : أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ : ((مَا كَانَ يَدَاً بِيَدٍ فَخُذُوهُ ، وَمَا كَانَ نَسِيئَةً فَذَرُوهُ))[٧٢].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە فرۆشتنی ئاڵتون و زیو و پارە گۆڕینەوە فەرموویەتی : ئەوەی كە دەست بە دەستە وەریبگرن ، وە ئەوەشی كە بە قەرزە و دوا دەخرێت ئەوا وازیلێبێنن .

قال الــحافظ : (مَعْنَى قَوْلِهِ : "مَا كَانَ يَدَاً بِيَدٍ فَخُذُوهُ" أَيْ مَا وَقَعَ لَكُمْ فِيهِ التَّقَابُضُ فِي الْمَجْلِسِ فَهُوَ صَحِيحٌ فَأَمْضُوهُ ، وَمَا لَمْ يَقَعْ لَكُمْ فِيهِ التَّقَابُضُ فَلَيْسَ بِصَحِيحٍ فَاتْرُكُوهُ)[٧٣].

واتە : ئەوەی كە لە مەجلیسی كڕین و فرۆشتن و گۆڕینەوەكەدا دەست بە دەست وەردەگیرێت ئەوە دروستە و بیبەنەسەر ، وە ئەوەی كە دەست بە دەست وەرناگیرێت لەو مەجلیسەدا ئەوە دروست نی‌یە وازی لێبێنن و ئەو كڕین و فرۆشتنە مەكەن .

---

[٧١] العــدة في شرح إحكام الأحكام : (٣ / ٥٤٢).

[٧٢] صحيح البخاري رقم : (٢٤٩٧) و (٢٤٩٨).

[٧٣] فتح الباري شرح صحيح البخاري : (٥ / ١٩٩).

**٣ ـ کڕین و فرۆشتن و گۆڕینەوەی ئاڵتون و زیو بەرامبەر بە یەکتر و بەرامبەر بە پارە بە قەرز دەبێت بە ڕیبا :**

کڕین و فرۆشتنی زێڕ و زیو بە قەرز حەرامە و دەبێت بە ڕیبا ، بۆیە دەبێت زەڕەنگەر **هەموو پارەکە بە تەواوی** لە کڕیار وەرگرێت ئەنجا زێڕەکە یان زیوەکە بدات بە کڕیار ئەگینا کڕین و فرۆشتنەکەیان دەبێت بە ڕیبا ، هەروەها کڕین و فرۆشتنی زەڕەنگەر لە گەڵ بازرگانەکاندا دەبێت بە نەقدی بێت نەك بە قەرز .

وە ئەگەر ئافرەتێت ویستی وابوو زێڕە کۆنە بەکار هاتووەکەی بگۆڕێتەوە بە زێڕێکی نوێ و تازە دەبێت گۆڕینەوەکە بەرامبەر بە یەکتر و یەکسان بێت و دەست بە دەستیش بێت نەك بە قەرز ، ئەگینا گۆڕینەوەکە دەبێت بە ڕیبا.

جا بۆ ئەوەی نەکەوێتە ناو ڕیبا خواردنەوە دەبێت زێڕە کۆنە بەکار هاتووەکەی لە لای دوکانێك بفرۆشێت و پارەکەی بە نەقدی وەرگرێت ، ئەنجا ئەگەر ویستی هەبوو زێڕی نوێ و تازە بکڕێت ئەوا دەچێت لە دوکانێکی تر زێڕی نوێ و تازە دەکڕێت بە پارە و دەست بە دەست و بێ دواکەوتن .

چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((لَا تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ ... ، وَلاَ تَبِيعُوا مِنْهَا غَائِبًا بِنَاجِزٍ))[٧٤].

واتە : زێڕ مەفرۆشن بە زێڕ ئیللا بەرانبەر بە یەك نەبێت ، وە با هەندێکیان لەوەی تریان زیاتر نەبێت ، وە هی ئامادە نەبوو مەفرۆشن بە ئەوەی کە ئامادەیە ، واتە با دەست بە دەست بێت و بە قەرز نەبێت .

قال الحافظ ابن حجر : (قَوْلُهُ : "الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ" : يَدْخُلُ فِي الذَّهَبِ جَمِيع أَصْنَافه مِنْ مَضْرُوب وَمَنْقُوش ، وَجَيِّد وَرَدِيء ، وَصَحِيح وَمُكَسَّر ، وَحُلِيّ وَتِبْر ، وَخَالِص وَمَغْشُوش ، وَنَقَلَ النَّوَوِيّ تَبَعًا لِغَيْرِهِ فِي ذَلِكَ الْإِجْمَاعَ)[٧٥].

**واتە : ئاڵتون بە ئاڵتون : هەموو جۆرە ئاڵتونێك دەگرێتەوە : لە ئاڵتونی کراو بە**

---

[٧٤] صحيح البخاري رقم : (٢١٧٧) ، وصحيح مسلم رقم : (١٥٨٤).

[٧٥] فتح الباري : (٤ / ٤٨٠).

پارە و نەخش کراو ، وە چاك و خراپ ، وە ساغ و شکاو ، وە پاك و تێکڵاو ، ئەمەش بە یەکدەنگی و کۆڕای زانایان وەك (نەووی) باسی کردووە .

وقال الشيخ محمد بن إبراهيم وابن باز وابن العثيمين وصالح الفوزان : (بيع الذهب بهذه **الأوراق النقدية** لا يصح إلا بشرط الحلول والقبض) .

واتە : فرۆشتنی ئاڵتون و زێڕ بە پارەی کاغەزی ئەم سەردەمە دروست نی‌یە ئیللا بە مەرجی دەست بە دەست نەبێت لە هەمان مەجلس و جێگای کڕین و فرۆشتن و گۆڕینەوەکەدا .

**٤ ــ کڕین و فرۆشتن بە** (قەرزی بەش بەش / بيع التقسيط) **بە زیادە خستنە سەر نەرخەکەی دەبێت بە ریبا :**

ئەمەش کاتێك ڕوو دەدات ئەگەر شتومەك بە دوو مەعمەلە بفرۆشن ، بۆ نموونە ئەگەر (سەلاجەیەك) بفرۆشێت ئەوا دەڵێت :

١ - بە نەقدی بە (٣٠٠,٠٠٠) دینار .

٢ - وە ئەگەر بە قەرز بیبەیت و بە (قسط) و بەش بەش نرخەکەیم بۆ بهێنیتەوە ئەوا بە (٣٥٠,٠٠٠) دینارە .

ئەم جۆرە کڕین فرۆشتنەش دەبێت بە ریبا چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَنْ بَاعَ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ فَلَهُ أَوْكَسهمَا أَوْ الرِّبَا))[٧٦] .

واتە : هەر کەسێك دوو کڕین و فرۆشتن لە یەك مامەڵەدا بکات ، ئەوا یان کەمترینیانی بۆ دەبێت یان ریبا ، بە واتایەکی تر : بفرۆش دەڵێت : بە نەقدی بە (٣٠٠,٠٠٠) دینار ، وە بە قەرزیش بە (٣٥٠,٠٠٠) دینار ، جا ئەگەر کڕیار بە (٣٠٠,٠٠٠) دینار بیکڕێت کە نرخە کەمەکەیە ئەوا دروستە ، بەڵام ئەگەر بە (٣٥٠,٠٠٠) دینار بیبات بە قەرز ئەوا دەبێت بە ریبا .

---

[٧٦] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٣٢٦) ، فائدة : للوقوف على حكم بيع التقسيط على هذا الشكل وأقوال العلماء فيه وأنهُ من الربا الملعون فاعلهُ راجع "السلسلة" : (٥ / ٤١٩ ــ ٤٢٧) فستجد فيه الكلام الشافي والقول الفصل في هذه المسألة .

# چەندپرسیارێكی ڕاستەخۆ
# و
# كۆتایی ئەم بابەتە

دوای ئەم ڕوون كردنەوەیە دەڵێم :

١ ــ ئایا زۆربەی هەرە زۆری كڕین و فرۆشتن و مامەڵەكانی بازاڕی ئەمڕۆی موسڵمانان بە گشتی و بازاڕی (پارە گۆڕینەوە) و (زەڕەنگەرەكان)یش بە تایبەتی ریبای تێكەڵ نەبووە و بەرهەمی ریبا نابەنەوە بۆ ماڵ و منداڵەكانیان ؟؟؟!

وەڵامەكەش : دەخەینە سەر ئەستۆی خوێنەری ئەم بابەتە ، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ ⁽٨⁾﴾ [المائدة] .

٢ ــ ئایا زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی كە لەم ڕۆژگارەدا قەرزدەكەن و قەرزی خەڵكیان بە سەرەوەیە وەفادارن و چاكەكاری خاوەن قەرزەكەیان لە پێش چاوە ؟ یان بوونەتە مایەی بێزاری و ناڕەحەت بوونی خاوەن قەرزەكان ؟

وەڵام : بە ڕاستی هەڵسوكەوتی نابەجێ و ناشیاوی زۆربەی قەرزارەكانی ئەم ڕۆژگارە بووەتە مایەی بێزاری و ناڕەحەت بوونی خاوەن قەرزەكان و ئەوەندە شوێنەوار و كاریگەری خراپی لێكەوتووەتەوە تا ئەو ئاستەی كە دەبینین كاتێك موسڵمانێك داوای قەرزێك دەكات لە موسڵمانێكی تر ڕاستەخۆ دەڵێت لە توانامدا نییە قەرزت بدەمێ ، هۆكاری سەرەكی ئەم هەڵوێستەش دەگەڕێننەوە بۆ بێوەفایی و هەڵسوكەوتی نابەجێ و ناشیاوی زۆربەی قەرزارەكانی ئەم ڕۆژگارە !!!

٣ ــ ئایا زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی كە زەڕەنگەرن خۆیان بە زمانی خۆیان دان بەوەدا نانێن كە زۆربەی هەرە زۆری مامەڵەكانیان ریبایە و ئەوان زێڕ بە زێڕ (ئاڵتون بە ئاڵتون) دەگۆڕنەوە و ئاڵتونیش بە قەرز دەكڕن و بە قەرزیش دیفرۆشن ؟؟؟!

وەڵام : بەڵی ، ئەمە ڕاستی‌یەكە خۆیان بە زمانی خۆیان دەیدركێنن و چاكیش دەزانن ریبا دەخۆن و ریباش دەدەن بە دەرخواری ماڵ و منداڵەكانیان ! ! !

٤ ـ ئایا زۆربەی هەرە زۆری پارەگۆڕەكان پارە و دراوەكان بە قەرز ناگۆڕنەوە و كڕین و فرۆشتنی پارە بە قەرز سیمایەكی ئاشكرا و زاڵ نی‌یە بە سەر بازاڕی (پارە گۆڕینەوە / سوق الـصرّافين) ؟؟؟!

وەڵام : ئەگەر ریبا خواردن سیفەتی پارە گۆڕەكانی سەردەمی (تابعین و پیاو چاكان) بێت وەك (الـحسن البصري و محمد بن سيرين) فەرموویانە : (واللهِ إنَّ هؤلاء الصيارفة لأكلةُ الربا ، وإنَّهم قد أَذِنُوا بِحَرْبٍ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ...)[٧٧] .

واتە : سوێند بێت بە خوا ئەو پارە گۆڕانە ریبا خۆرن ، وە ئەوان جەنگیان ڕاگەیاندووە دژ بە خوا و پێغەمبەرەكەی (ﷺ) .

جا ئەگەر ئەمە سیفەتی پارە گۆڕەكانی ئەو سەردەمە بێت دەبێت پارەگۆڕەكانی ئاخرزەمان چی بڵێین ؟!!

## كۆتایی

وە لە كۆتایی ئەم بابەتەدا دەڵێم :

**بیرخستنەوەیەك :**

ریبا جۆر و دەرگای زۆری هەیە و خواردنی ریبایش زۆر ترسناكە ، بۆیە ئەگەر شارەزا نەبێت ئەوا ڕزگاربوونت لە ریبا خواردن كارێكی ئاسان بە تایبەت لەم سەردەمەدا !

**ـ ریبا (٧٣) دەرگایە و تاوانێكی زۆر گەورەیە :**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((الرِّبَا ثَلَاثَةٌ وَسَبْعُونَ بَابًا أَيْسَرُهَا مِثْلُ أَنْ يَنْكِحَ الرَّجُلُ أُمَّهُ))[٧٨] .

---

[٧٧] تفسير ابن كثير : (١ / ٣٠٢) .

[٧٨] صحيح الـجامع الصغير رقم : (٣٥٣٩) ، وسلسلة الأحاديث الـصحيحة رقـم : (١٨٧١ ) : (٤ / ٤٨٨ ) .

واتە : ریبا حەفتاوسێ (٧٣) دەرگایە : ئاسان ترین و سوک ترینیان وەك ئەوە وایە کە : پیاو زینا و داوێن پیسی لە گەڵ دایکی خۆیدا بکات .

**- ریبا خواردن لە زینا کردن و داوێن پیسی زۆر گەورەترە :**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((دِرْهَمُ رِباً يَأْكُلُهُ الرَّجُلُ وَهُوَ يَعْلَمُ أَشَدُّ مِنْ سِتَّةٍ وَثَلاَثِينَ زَنْيَةً))[٧٩].

واتە : درهەمێك لە ریبا کە پیاو بیخوات و بیشزانێت ئەو درهەمە بە ریبا پەیدای کردووە ، ئەوا تاوان و تۆڵە و خراپی و سزای خواردنی ئەو درهەمە توند و زیاترە لە : (٣٦) سی و شەش زینا و داوێن پیسی ئەنجام دان .

**- لەعنەت کراوە لە ریبا خۆر و هاوکاریکارەکانی :**

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ : ((لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) آكِلَ الرِّبَا وَمُوكِلَهُ وَكَاتِبَهُ وَشَاهِدَيْهِ ، وَقَالَ : هُمْ سَوَاءٌ))[٨٠].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەعنەتی کردووە لەو کەسەی کە :

١ / ریبا دەخوات : (آكِلَ الرِّبَا) .

٢ / وە ئەوەی کە ریبا دەدات بە دەرخواردی ریبا خۆرەکەدا : (مُوكِلَهُ) .

٣ / وە ئەوەی کە بەند (عەقد)ی ریباکە دەنوسێت : (كَاتِبَهُ) .

٤ / وە ئەو دوو شایەتەی کە شایەتی دەدەن لە سەر بەند (عەقد)ی ریباکەدا لە نێوان ریبا خۆر و ئەوەی دەیدات بە دەرخواردیا : (شَاهِدَيْهِ) .

وە ئەمانە هەموویان لە تاوانی ریبادا یەکسانن .

بۆیە دەبێت موسڵمانان چاك بزانن کە خواردنی نان و ماڵی ئەوانەی کە مامەڵە و کڕین و فرۆشتن بە ریبا دەکەن حەرامە و پیس ترە لە نان و ماڵی (ویسکی وبیرە) فرۆشەکان ! بەڵکو پیس تریشە لە لە نان و ماڵی ئەوانەی کە بە (داوێن پیسی و بێ ئەخلاقی) پارە پەیدا دەکەن ! ! !

---

[٧٩] صحيح الجامع الصغير رقم : (٣٣٧٥ ) ، و السلسلة الصحيحة رقم : (١٠٣٣ ) : (٣ /٣٩ ) .

[٨٠] صحيح مسلم رقم : (١٥٩٨) يعني : هم سواء في الإثم .

**ئامۆژگاریەك بۆ ئافرەتان :**

پێویستە لە سەر هەموو ئافرەتێکی موسڵمان و حەڵاڵ زادە کە ئاگای لە مێردەکەی بێت ئەم دوو خاڵەی لە یاد نەچێت :

١ ـ نابێت فشار بخاتە سەر مێردەکەی بۆ پارە و ماڵ پەیدا کردن بە هەر شێوەیەك بێت ئەگەر چی بە ڕێگای حەرامیش بێت وەك قەرز کوێری و ریبا خواردن !

٢ ـ بەڵکو دەبێت ئامۆژگاری مێردەکەی بکات بەوەی کە ڕزق و ڕۆزی و پارەی حەڵاڵ بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی پەیدا بکات .

وە دەبێت هەڵوێستی وەکو ئەو ئافرەتەی پێشینان بێت کە کاتێك مێردەکەی لە ماڵ دەردەچوو بۆ کەسابەت و بژێوی هێنانەوە بۆ منداڵەکانی پێی دەووت : (اتقِ اللهَ ولا تأتِنا بالحرامِ ، فإنَّا نصبرُ على الجوعِ ، ولكن لا نطيقُ نارَ جهنَّم) .

واتە : ئەی مێردەکەم لە خوا بترسە و پارە و ڕزق و بژێوی حەرامان بۆ مەهێنەوە ، چونکە ئێمە ئارام دەگرین لە سەر برسێتی ، بەڵام توانای ئاگری دۆزەخمان نی‌یە .

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە فەرموویەتی : (إيَّاكَ والكَسْبِ الحَرام ، فإنَّا نصبرُ على الجوع ، ولا نصبرُ على النار) .

واتە : ئامان سەد ئامان ووریای کەسابەتی حەرام ببە ، چونکە ئێمە ئارام دەگرین لە سەر برسێتی ، بەڵام ئارام ناگرین لە سەر ئاگری دۆزەخ .

منیش دەڵێم : خۆزگە ئافرەتانی ئەم سەردەمەش تا بەم شێوازە ببوایەن لە گەڵ مێردەکانیاندا ، ئەو کاتە هەستمان دەکرد بە خۆشی ژیان و دەمان بینی ژیانمان چەند ئاسودە دەبوو !

لە ڕاستیدا ئەم هۆکارێکە لە هۆکارەکانی هاندانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خواستنی ئافرەتی صالح کە فەرموویەتی : ((لِيَتَّخِذْ أَحَدُكُمْ ... وَزَوْجَةً صَالِحَةً تُعِينُهُ عَلَى أَمْرِ الآخِرَةِ))[٨١].

---

[٨١] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢١٧٦) .

واتە : با یەکێك لە ئێوە ئافرەتێکی چاك و صالح هەڵبژێرێت بۆ هاوسەرێتی و هاوبەشێتی ژیانی کەوا هاوکاری بکات لە بواری دوا ڕۆژیدا .

هەروەها فەموویەتی : ((فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ))[٨٢] .

واتە : هاوسەری دیندار و ئایین پەروەر هەڵبژێرە و وەك دەستکەوتێکی بە نرخ بەدەستی خۆت بخە .

وە هەروەها فەموویەتی : ((مَنْ رَزَقَهُ اللَّهُ امْرَأَةً صَالِحَةً فَقَدْ أَعَانَهُ عَلَى شَطْرِ دِينِهِ ، فَلْيَتَّقِ اللَّهَ فِي الشَّطْرِ الْبَاقِي))[٨٣].

واتە : هەر کەسێك خوا ئافرەتێکی صاڵحی پێبەخشی ئەوا یارمەتی داوە لە سەر بەڕێوەبردنی نیوەی دینەکەی ، وە با لە خوا بترسێت لەو نیوەکەی تریدا .

بەڵام ئەگەر ئافرەت صاڵح نەبوو ئەوا ... !!!

**فالحمدُ للهِ على كُلِّ حالٍ ، ونعوذُ باللهِ من حالِ أهل النار ...**

---

[٨٢] صحيح البخاري رقم : (٥٠٩٠) وصحيح مسلم رقم : (١٤٦٦) .

[٨٣] صحيح الترغيب والترهيب رقم : (١٩١٦) ، وانظر : سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٦٢٥) .

# ناوەڕۆك

## لە بەرهەمەکانی نووسەر

١ ـ سێ بنچینەکەی بیروباوەڕ و بەڵگەکانیان ـ چاپی چواردەیەم ـ .

٢ ـ بیروباوەڕت وەربگرە لە قورئان و سوننەت ـ چاپی بیست و حەوتەم ـ .

٣ ـ پوختەیەك لە بیروباوەڕی ئیسلامەتی ـ چاپی چواردەیەم ـ .

٤ ـ کورتەیەك لە فیقهی سوننەت و قورئانی ئازیز ـ ئامادە دەکرێت بۆ چاپ ـ .

٥ ـ برایەتی نێوان موسڵمانان .... ـ چاپی دوانزەیەم ـ .

٦ ـ لەگەڵ کێدا دادەنیشیت و هاوڕێیەتی کێ دەکەیت ؟ ـ چاپی نۆزدەیەم ـ .

٧ ـ چۆنێتی قوربانی کردن لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ـ چاپی چوارەم ـ .

٨ ـ کاتی پارشێو و بەربانگ کردن لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ـ چاپی شەشەم ـ .

٩ ـ حوکم و ئادابەکانی قەرزدان و قەرزکردن و قەرزدانەوە .. ـ چاپی پێنجەم ـ .

١٠ ـ فەتوای گەورە زانایانی هاوچەرخی ئەهلی سوننە و جەماعە سەبارەت بە حوکمی حزبایەتی و جیاوازی و پارچە پارچەگەرێتی ـ چاپی سێیەم ـ .

١١ ـ لە ئیسلامدا چەندین گروپ و حیزب نییە بەڵکو کۆمەڵی موسڵمانان و خەلیفە هەیە ـ چاپی یەکەم ـ .

١٢ ـ حوکمی کۆمەڵ و حزبە ئیسلامییەکان لە نێو کۆمەڵگای موسلمانانادا / فەتوای هەردوو شێخ : (ابن باز) و (ابن العثیمین) ـ چاپی یەکەم ـ .

١٣ ـ ئایا لەم دەرگایەت داوە ؟ (پاڕانەوە لە خوای پەروەردگار) ـ چاپی دوانزەیەم ـ .

١٤ ـ فەزڵ و گەورەیی و حوکمەکانی دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەردا (ﷺ) ـ چاپی حەوتەم ـ .

### * زنجیرەی ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا :

١٥ ـ یەکەم : ئافرەتان و فێربوونی زانستی شەرعی ـ چاپی دوانزەیەم ـ .

١٦ ـ دووەم : زانا ترین ئافرەتی دونیا ـ چاپی دوانزەیەم ـ .

١٧ ـ سێیەم : لە دایك بوونی کچان و سەرهەڵدانەوەی خەسڵەتێکی سەردەمی نەفامی و جاهلی لە سەدەی پێشکەوتووی بیست و یەکدا !!! ـ چاپی دوانزەیەم ـ .

### * زنجیرەی بابەتە مەنهەجی یەکان :

١٨ ـ یەکەم : گەڕانەوە بۆ لای زانایانی ئەهلی سوننە پارێزەرە لە تیاچوون و گومڕابوون ـ چاپی سێیەم ـ .

١٩ ـ دووەم : لە بناماكانی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە : خۆشویستنی زانایان و بە چاكە باسكردنیانە ... ـ چاپی دووەم ـ .

٢٠ ـ سێیەم : زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعەی سەردەم دەڵێن : حزبایەتی بیدعەیە ـ چاپی دووەم ـ .

٢١ ـ چوارەم : جەماعەتی (الإخوان المسلمین) لە تەرازووی شەرع و ژیریدا ، هەڵە و لاڕێبوون و گومراییەكانی جەماعەتی (الإخوان المسلمین) لە دیدی زانایانی ئەهلی سوننەی سەردەمەوە ـ چاپی سێیەم ـ .

٢٢ ـ پشكێك لە میراتەكەی پێغەمبەر (ﷺ) ـ چاپی حەوتەم ـ .

٢٣ ـ چل فەرموودەكەی نەوەوی (الأربعون النووية) ـ چاپی شەشەم ـ .

٢٤ ـ وەڵامی پرسیارە شەرعیەكانی سایتی بەهەشت ـ چاپی دووەم ـ .

٢٥ ـ تەفسیری سورەتی فاتیحە ـ چاپی پێنجەم ـ .

٢٦ ـ (وانە گرنگەكان بۆ تێكڕای موسڵمانان / الدروس المهمة لعامة الأمة) ـ چاپی شەشەم ـ .

٢٧ ـ وتەی زانایانی مەزهەبی ئیمامی شافعی ڕەحمەتی خوایان لێبێت سەبارەت بە كات و شوێن و شێوازی سەرەخۆشی كردن و پرسە و تەعزێ گێڕان ـ چاپی سێیەم ـ .

٢٨ ـ توێشووی بانگخواز بۆ لای خوای گەورە ـ چاپی سێیەم ـ .

* لەو بەرهەمانەی تر كە كاریان بۆ دەكەم :

ـ قەڵای بیروباوەڕ و یەكخواپەرستی ـ وەرگێڕانی چەندین كتێب ـ .

ـ مەرجەكانی باڵاپۆشی شەرعی ئافرەتی موسڵمان و هەندێك بابەتی پەیوەندیداری تریش .

ـ چۆنێتی شۆردن و كفن كردن و نوێژ كردن و ناشتنی مردوو / لەگەڵ ئەحكامەكانی تەعزێ و تەعزێباری لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) .

ـ باخچەی پیاوچاكان لە فەرموودەی سەروەری پێغەمبەران (ﷺ) وەرگێڕانی : (رياضُ الصالحين من حديث سيد المرسلين ﷺ) .

* قال شفيق بن إبراهيم البلخي : (قلنا لابن المبارك : إذا صليتَ معنا لِمَ لا تَجلِسُ معنا ؟ قال : أذهبُ فأجلسُ مع التابعين والصحابة ، قلنا : فأين التابعون والصحابة ؟ قال : أذهبُ أنظرُ في علمي فأدرك آثارهم وأعمالهم ، ما أصنع معكم ؟! أنتم تجلسون تغتابون الناس ، فإذا كان سنة مائتين فالبعدُ من كثير من الناس أقربُ إلى الله تعالى ، فِرَّ من الناس كفرارك من الأسد ، وتَمسَّكْ بدينك ، يسلَمُ لك لَحمُكَ ودَمك) [تقييد العلم للخطيب البغدادي : (١٦٤)] .

**Kteb Xana کتـــێـــبخانـــە**

public channel

**Description**

کتێبخانە پێگەیەکە بۆ زیاتر فێربون و دورکەوتنەوە لە نەزانین. 📚

هۆشیاری ڕۆشنبیری تاک لە کۆمەڵگە.
پەرەپێدانی ڕۆشنبیری تاک.
گەشەپێدانی هزری تاک.

@haval_pashaie10

ئـــەکاونـــتـــەکانـــم ✔️ ⬇️
https://linktr.ee/havalpashaie

t.me/kteb_khana2

Invite Link



Notifications

On

